بسم الله الرحمن الرحيم

«إنما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله ثم لم يرتابوا وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل الله أولئك هم الصادقون»

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکی:

## ١-پێناسەی عەقیدە :

عەقائید کۆی وشەی «العقیدة» یەو عەقیدەش وشەیەکی عەرەبییە و ـ لەکوردیدا بەواتای بیرو باوەڕ دێ و ـ بەوشتە دەگوترێ عەقیدە : کە بەدڵ بڕوات پێی هەبێ و لێی دڵنیا بیت ولات یەقین بێ و گومانی ناوێتە نەبی و دوودڵی تێکەڵ نەبێ ..

## ٢- پلەکانی باوەڕبوون :

لەبارەی بە هێزی و بێ هێزی عەقیدەوە خەلکی دەبنە چەندەها بەشەوە ـ ئەویش ـ بەپێی روونی بەلگەکان و جێگیر بوونی لەدڵ و دەروونیاندا، بائـەم مەبەستەت بەم نموونەیەی خوارەوە بـۆ روون بکەمەوە : ئەگەر پیاوێك ناوی شارێکی بیستبێ وخۆی نەیدیتبێ

بۆ نموونە وەك ـ پایتەختی ـ یەمەن ، ئەم قسەیەشی لەپیاوێکی درۆزنە وە نە بیستبێ و پیاوەکە درۆ ی لێنەبیسترابێ ، حەتمەن باوەڕ بە بوونی ئەو شارە دەکات وعەقیدەی پێی دەبێ ، خۆ ئەگەرلەچەند کەسێکی تریشەوە ئەم هەواڵەی بیست، متمانەی زۆرترده بێ ، هەرچەند ئەگەر چاوو راویان لێکرد لەوانەیە گومانی بۆ دروست ببی و بکەوێتە شکەوە . بەڵام ئەگەر رەسمێکی فۆتۆگرافی (بەکامێرە گیراوی) شارەکەی بینی ، زەحمەتە شك وگومان بتوانێ رووی تێبکات ، چونکە دەلیل و بەلگەکەی بەهیزە ..

خۆ ئەگەر سەفەری کردو لە دوورەوە نیشانەکانی شاری بینی ، یەقینی زیاتر دەبێ وگومانی لادەچێت ، خۆ ئەگەر لەناو شاردابەزی و بە چاوی خۆی شارەکەی بینی ، بوارێك بۆ گومان و دوودلی نامێنێتەوە و باوەڕ بەبوونی ئەوشارە لەدلیا بە پتەوی دەچەسپێ و ئەگەرهەرچی کەسیش هەیە بە پێچەوانە وە قسەی بۆ بکەن، مەحالە لەو باوەڕەی پەشیمان بێتەوە.

جا ئەگەر بەشەقام وکۆڵانەکانیا گەڕاو دەستی کردە توێژینەوەی حاڵ و وەزعی شارو خەلکی شار و لەو بارەوە ئاگاداری و پسپۆڕی زیاتری بەدەست هێنا ، ئەمەش زیاد لە عەقیدەکەی دەبێتە روونکەرەوە یەك بۆباوەڕەکەی ..

***

کاتێ ئەمەت زانی ئەوە بزانە کەلەبارەی عەقیدەکانی دینیشەوە، خەلکی ناوەها دەبنە چەند بەشێکەوە: هی وایان هەیە خۆی وەك تەلقینێك بۆی باسکراوە و وەك عادەت و نەریتێك بروای پێیەتی، ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر گومان بخرێتە بەردەمیان لەوانەیە شك وگومان لە عەقیدەکەیانا دروست ببێ ، هی وایشیان هەیە خۆی سەرنج دەدات و بییردەکاتەوە و باوەڕی زیاد دەبێت و یەقینی بە تیین دەبێ، هی وایش هەیە لە سەرلجدانا بەردەوام دەبێت و بییری خۆی دەخاتەکار و، خوا پەرستی و بەجێهێنانی فەرمانەکانی و گەردنکەچی لە عیبادەتەکانیا دەکاتە کۆمەکی خۆی و بەوجۆرە چرای هیدایەت و ڕێنموونی لە دڵ و دەروونیا ڕۆشن دەبێت و بەنووری بینایی دلی شتانێك دەبینێ کە دەبێتە هۆی کامڵ بوونی ئیمانی و تەواو بوونی یەقینی ودامەزرا ندنی دڵ ودەروونی. خوایش دەفەرموێ: «***والذین اهتدوا زادهم هدی وآتاهم تقواهم***» محمد/١٧. واتە: ئەوانەی هیدایەتیان دەوێت خوا ڕێنموونی و هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات و پارێزکاری و تەقوایان پێ دەبەخشێت ..

بۆیە ئەم نموونەیەم بۆ هێنایتەوە تاخۆت لەوە بلندتر بزانی کە لە خوا بە یەکناسیین (توحید)دا چاولێکەری بکەیت ، یالاسایی خەلکی بکەیتەوە. دەبێ هەولبدەیت و بییرت بخەیتەکار بۆحالیبوون لە عەقیدەکەت ، بۆ زانیین و ناسیینی بنچینە و توسوولی دینەکەت

تاعەتی خوا بکەرە کۆمەکی خۆت، تا دەگەیتە پلەو پایەی پیاوان و بە پلەکانی کەمالدا سەردەکەویت و بەرزدە بیتەوە..

شاعیر دەلێ :

**بۆ کارێکی گرنگ هەلیان بژاردوویت گەر پێی بزانی ،**
**خۆت رابلـند بگرە نەچیتە ریزی بێ موبالاتەکانەوە ..**

## ٣ - *رێزی ئیسلام بۆ عەقل :*

وەك هەموو ئەحکامێکی تری شەرع بنچینەی عەقیدە و باوەڕە ئسلامییەکانیش قورئان و سوننەتە، کتێبی خوای تەعالاو سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی - صلى الله عليه وآله وسلم - لـەگـەڵ ئەوەدا پێویستە بزانیت کە هەموو ئەو عەقیدانە عەقلْ پشتگیریانە وسەرلجی دروست دەیانسەلمێنێ، لەبەر ئەوە دەبینین خوا رووی رێزی کردۆتە عەقلْ و کردوویەتە جێگەی تەکلیف - ئەوەتە ئەگەر کەسێك شێت بێت هیچ تەکلیفێکی شەرعی لە سەر نامێنێ - ، وە عەقلْ بۆ لێکۆڵـینـەوە و سەرنجدان و بیبرکردنەوە هان دەدات، ئەوەتە خوای تەعالادەفەرموێ :

« *قلا نظروا ماذا في السموات والارض وماتغني الايات والنذر عن قوم لا يؤمنون* » یونس/١٠١. واتە : ئەی موحەمەد ، پێیان بلێ: سەرنج بدەن و ببینن لە ئاسمان و زەویدا چەندەها ئایەت و بەلگە لە سەر تاك و تەنیایی خوا هەیە ، بەلاّم ئەو خەلکەی نەیەوێ ئیمـان بێنێت نە پێغەمبەران سوودیان پێ دەگەیەنن ونە نیشانەکان ..

وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: «أفلم ينظروا الى السماء فوقهم كيف بنيناها وزيناها ومالها من فروج ، والارض مددناها والقينا فيها رواسي وانبتنا فيها من كل زوج بهيج ، تبصرة وذكرى لكل عبد منيب ، ونزلنا من السماء ماء مباركا فانبتنا به جنات وحب الحصيد ، والنخل باسقات لها طلع نضيد ، رزقا للعباد واحيينا به بلدة ميتا ؟ كذلك الخروج.» ق/١١.

واتە: ئەوە بۆ سەرنج نادەنە ئەو ئاسمانەی بەلای سەریانەوە یە ، چۆن دروستمان کردووەو بێ کۆ لەکە بەرزمان کردۆتەوە وبەئەستێرەکان رازاندومانەتەوە ، بێ ئەوەی هیچ درزو قلیشێکی تیابێت ؟ ئەوە بۆ سەرنج نادەنە زەوی چۆن رامانخستووە ودرێژەدارمان کردووە و کەژو چیا کانمان تیا دروستکردووە ؟ وە لە هەموو جۆرە رووەکێکی جوانمان تیا رواندووە ، تا ببنە چاو روونی و یاد خستنەوە بۆ هەموو ئەو عەبدانەی بە هۆی سەرنجدان و بیرکردنەوە وە دەگەرێنەوە و واز لەخراپە دێنن ، لە هەورەکانی لای سەرروویانەوە ئاوی پڕ پیت و بەرەکەتمان باراندووە ، باخی سەر سەوز و درەختی پڕ بەرو دانەویلە و کشت و کالمان پێ سەوزکردووە ، لە گەڵ دارخورمای بالآبەرزی گەردنکەشدا ، هێشووی هۆنراوە و پڕ بەریان هەیە ، تا رزق و رۆزی بن بۆ ئادەمیزادەکان ، بەو ئاو و بارانە زەو ییەکی وشکی مردوومان پێ زیندوو کردۆتەوە ؟ ئاوەها ئێوەش دوای مردن زیندوو دەکرێنەوە .

خوای تەعالا سەرزەنشتی ئەوانە دەکات کە بیر ناکەنەوە و سەرنج نادەن و لە نیشانەکانی خوا وردنابنەوە، ئەوەتە دەفەرموێ :
***« وکأين من آية في السموات والارض يمرون عليها وهم عنها معرضون »*** یوسف/١٠٥.
واتە:لەسەر تاك وتەنیایی خوا چەندەها ئایەتونیشانە لەزەوی و ئاسماناندا هەیە ،کەچی بەلایانا دەڕۆن وسەرنجیان نادەن و بیریان لێناکەنەوە و روویان لێوەردەگێڕن و پشتیان تێدەکەن ..
خوا بۆ ئەوەی ڕێز بۆ بەڵگە دابنێ و شەرەف بۆ دەلیل دەربخات داوا لە نەیارەکانی دەکات:بەڵگە بۆ ئیددیعاکانی خۆیان بێننەوە - هەرچەند ئیددیعاکانیشیان بە ئاشکرا پووچ و بەتاڵە - ئەوەتە لە فەرموودەدا هاتووە و باسکراوە کە بیلالی حەبەشی - خوا لێی رازی بێ - دێت بانگی بەیانی بدات،دەبینێ پێغەمبەر- صلی الله علیه وآله وسلم - دەگری، ئەویش هۆی گریانەکەی لێدەپرسێ، لەوەڵامدا دەفەرموێ :
***«ويحك يابلال، ومايمنعني أن أبكي وقد أنزل الله علي هذه الليلة [ إن في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لايات لأولي الألباب]*** آل عمران / ١٩٠. ***ثم قال : ويل لمن قرأها ولم يتفكر فيها »***.
واتە: هاوار بۆ تۆ ئەی بیلال، چۆن نەگریم ئەم شەو خوایتەعالا ئەم ئایەتانەی بۆ ناردومەتە خوارێ :« بێگومان لە دروستکردنی

ئاسمانان و زەو ی وگۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها ئایەت و نیشانە لەسەر تاك و تەنیایی خوا هەیە بۆ ئەوانەی عەقلّ وهۆشی خۆیان بەكاردێنن ، ئینجا فەرمووی: وەیل بۆ ئەوەی دە یخوێنێتەوە و بیـیری لێناكاتەوە ..

لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە كە ئیسلام فیكرو بیری مرۆڤ وشك ناكات و قوفلی لێنادات ، بەلاّم ڕێنموونی دەكات تا سنووری خۆی بزانێ و هەست بە كەمزانیاری خۆ ی بكات ،لە هەمانكاتا هەلی دەنێ تا هەولّ بۆ پتەوكردنی زانیاری و زانستی خۆی بدات، ئەوەتە خوا دە فەرمویّ:« *وما أوتيتم من العلم الا قليلا* » الإسراء/٨٥ .

واتە : شتێكی كەمتان لە زانیاری پێ بەخشراوە . لە گەلّ ئەوە شدا دەفەرموێ : « ... *وقل ربي زدني علما* . » طه / ١١٤. واتە : ئەی پەروەردگارم ، زانیاریم زیاد بكە ..

***

## ٤- *بەشەكانی عەقیدەی ئیسلامی :*

عەقیدە ئیسلامییەكان دەكرێنە چوار بەشی سەرەكییەوە و هەر بەشێكیشیان چەندەها لقی لێدروست دەبێت ..

*بەشی یەكەم ئیلاهیات ـ الالهيات ـ*، ئەمەش باسی ئەو شتانە دەكات كە پەیوەندییان بە بوونی خوای تەعالاو صیفەت و ناوە پیرۆزەكانی وكردەوەكانیەوە هەیە . وەئەو شتانەش كە بیرو

باوەڕ لە سەرعەبدی پێویست دەکات بەرامبەر بە خواو خاوەنی خۆی، دەکرێنە پاشکۆی ئەم بەشە ..

*بەشی دووەم لەهووات ـ النبوات ـ*، ئەم بەشەیش باسی هەموو ئەو شتانە دەکات کە پەیوەندییان بە پێغەمبەرانەوە هەبێت ـ سلاوی خوایان لێ بێت ـ لە بارەی صیفات و بێگوناهییان و ئەرکی سەرشانیان و پێویستی ئادەمیزاد بە پەیامەکانیان و ئەو شتانەش کە پەیوەندی بە ئەولیاو پیاوچاکانەوە هە بێت ـ خوا لێیان رازی بێ ـ لەگەڵ باسی موعجیزەو کەرامات وکتێبە ئاسمانییەکاندا، دەکرێنە پاشکۆی ئەم بەشە ..

*بە شی سێ هە م : رۆحانیهات* ـ الروحانیات ـ ، ئەم بەشەش باسی ئەو شتانە دەکات کە پەیوەندییان بە جیهانی غەیرە ماددیەوە هەیە . وەك فریشتەکان ـ سلاوی خوایان لێ بێ ـ و پەری وگیان ـ الجن و الروح

*بەشی چوارە م : سە مـعـییات - السمعیات-*، ئـــە مـە ش پەیوەندی بە ژیانی دوای مردن ـ حیاة البرزخ ـ و ژیانی پاشە رۆژەوە هەیە .وەك حالی قـەبرو نیشانەکانی قـیامـەت و زیندووبوونەوە و مە یدانی حەشرو حیساب و بەرپرسیاری و پاداشت و تۆلە و سزای پاشەرۆژ ..

* * *

## بەشی یەکەم - الالهیات :

### *خودی خوای تە بارە کە وە تە عالا :*

ئەی براکەم ، ئەوە بزانە ـ خوا رێنموونی ئێمە وتۆیش بۆ حەق بکات ـ کە خوای تەبارەك وە تەعالا زۆرلەوە مەزنترو گەورەترە عەقلی ئادەمیزاد پەی بەزاتی ببات ، یا بییرو هۆشی مرۆڤ دەرکی بکات . چونکە بییرو هۆ شی مرۆڤ هەرچەند لە دەرك و تێگەیشتنا پلەیەکی بالاّی هەبێت ، هێزو توانایەکی سنووردار و دیاریکراوی هەیە ، پشت بەخوا لەباسێکی سەر بەخۆ دا ـ بەتایبەتی ـ بۆت باس دەکەم ، ئەوسا تێدەگەیت ودەزا نیت کەعەقلّ و هۆشی ئینسان چەندکۆ لّ و زەبوونە لە بەرامبەر دەرکی حەقیقەتی شتەکانەوە ..

بەلاّم ئەوەندە بەسە کە بییرت بخەمەوە چەندەها شت هەیە ئێستا دەستی تێوە دەدەین و هەستی پێدەکەین و عەقلەکانمان لە گەورە یانەوە تا پچووکیان سوود لەچەندەهاشت وەردەگرن و حەقیقەتەکا نیشیان نازانن ، ئەوە کارەبا ، ئەوە مرگناتیس و چەندەها شتی تریش ،

هێزێکن بەکاریان دێنین و سوودیـان لێوەردەگـر ین و هیچ شتێ لە ماهییەت وحەقیقەتیان نازانین ،گەورەترین زانا ئالەم کاتەدا ناتوانێ لەو بارەوە سوودێکت پێ بگەیەنێت. لەگەڵ ئەوەشدا ناسین و زانینی زات وحەقیقەتی ئەو شتانە سوودێکمان پێ ناگەیەنن ، ئەوەندە لەو تایبەتیانەیان بزانین کە سوود بەخشن بۆمان ئیتر بەسمانە ..

خوێنەری هێژا ، ئەگەرلە بارەی ئەو شتانەوە کە خۆمان هەستیان پێدەکەین و دەستیان تێوە دەدەین ئەوە حالمان بێ ، ئەی دەبێ لە بەرامبەر زاتی خوای تەعالاوە حالمان چۆن بێ ؟! چە ندەها تاقم کە لەبارە ی زاتی خواوە قسە یان کردووە سەریان لێشێواوە و قسەکردنە کەیشیان لەو بارەوە بووەتە هۆی گومرایی وگیرۆدەیی و ناکۆکییان . چونکە لەبارەی شتێکەوە دەدوێن کە دەرکی سنووری ناکەن ، لەبەر ئەوە ناتوانن دیاری بکەن و توانای ناسینی حەقیقەت و ماهییەتیان نییە . هەر هۆی ئەوەشە کە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه و آله وسلم ـ نەهی کردووە لەوەی بیر لەزاتی خوا بکرێتەوە ،کەچی فەرمانی کردووە بیر لە دروستکراوەکانی خوا بکرێتەوە ..

***بیرکردنەوە لە خودی خوا :***

ئیبنوعەبباس ـ خوا لێیان رازی بێ ـ دەڵێ : تاقمێك لـە بارەی خودی خواوە بیـریـان دەکردەوە، پێغـەمبەریش ـ صلی الله علیه وآله وسلم ـ فەرمووی: « ... ***تفکروا في خلق الله ولا تفکروا في الله، فإنکم***

*لن تقدروا قدره*»(١) بیبر لە دروستکراوەکانی خوا بکە نەوە ،نەك لە خودی خوا ،چونکە لە تواناتاندا نییە مافی خۆی بدەنێ . وە نەبی ئەمەش ئازادی بیرو هۆشی ئادەمیزاد زەوت بکات ، یا باس و لێکۆلینەوەی وشك بکات ، یا تەنگ بە عەقلّ و هۆشی هەلچنێ . نەء بەلکو پارێزگارییە لە عەقلّ و هۆش تا بەرەو کە ندەلاّنی سەر گەردانی تلێر نەبێتەوە ..

وە هەروەها دوور خستنەوەی عەقلە لە چارەسەرکردنی باسێك کە وەسیلەی چارەسەر کردن و باس لێکردنی لە دەستا نەبێ و لە توانای هێزو قووەتی ئەودا نەبێت هەرچەند ئەو عەقلەش مەزن و گەورە بێت ..

ئەمەش رێبازو رێرەوی پیاوچاکان بووە ، ئەوانەی بە ندەی راستەقینەی پەروەدگاریان بوون و مەزنی و گەورەیی زاتی خوایان ناسیوە و زانیویانە چ قەدرو رێزێکی گەورەی هەیە ..

لە بارەی خوای تەبارەك وە تەعالاوە لە [شیبلی] یان پرسی ـ بەرەحمەت بێ ـ ئەویش گوتی : خوا خوایەکی تەنیاو ناسراوە، و پێش پێناسە و ئەو پیتانەش کەوتووە کە پێناسەیان پێ دەکرێت ..

---

١ـ حافظی عیراقی دەلێ: ئەبو نەعیم لە(حلیة)دا بەسەنەدێکی لاوازەضعیف» ریوایەتی کردووە، وە ئەسفەهانیش لە(تەرغیب وتەرهیب)دا بەسەنەدێکی لەو ساغتر ریوایەتی کردووە، وەهەروەها «أبو الشیخ»یش ریوایەتی کردووە. بەلاّم بە هەموو حالێك واتاکەی ساغو دروستە ..

بە(یەحیای کوری موعاز) یان گوت: باسی خوامان بۆ بکە. ئەویش گوتی: خوا تاك و تەنیایە. گوتیان: خوا لەکوێیە ؟ گوتی: خوا لە بۆ سەوکەمین دایە . پرسیارکەرەکە گوتی: من لەو بارەوە پرسیارت لێناکەم . ئەویش گوتی : ئەوەی بۆم باسکردی صیفەتی خالیق بوو، هەر شتێکی ترت جگە لەوە بۆ باس بکەم دەبێتە صیفەتی مەخلوق ..

کەوا بوو بەبیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا و دەستگرتن بەو شتانەی پێویستی صیفەتەکانیەتی هیممەتی خۆت بەرزبکەرەوە بۆ تێگەیشتن لەمەزنی و گەورەیی خوا .

## *ناوە پیرۆزەکانی خوا :*

بێگومان خوای تەعالاکە لە هەموو شتێکدا دەستی توانایی هەیە بە هۆی ئەو ناوو صیبفەتانەیەوە کە لایەق بەگەورە یی و جەلالی ئەون خۆی بە مەخلوقی ناساندووە، واچاکە بۆ ئیماندار بۆ بەرەکەت ئەو ناوانە لەبەربکات و بەباسکردنیان لەزەت بچێژێ وڕێز بۆ گەورەییان دابنێ ، وە ئەوەش ئەو فەرموودە دروستە یە کە ناوەکانی لە خۆیا کۆکردۆتەوە، باشترین مامۆستاش فەرموودەی پێغەمبەری خودایە، وچاکترین رابەرو رێپیشاندەر زمانی وەحی و دەلاقەی نووری پێغەمبەرایەتییە..

ئەبو هورەیرە -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وآله

وسلم ـ فەرمووی: « لله تسعة وتسعون إسما، مئة الا واحدا، لا يحفظها أحد الا دخل الجنة ، والله وتر يحب الوتر » رواه البخاری

وسلم ـ واتە: خوای تەعالا نەوەدو نۆ ناوی هەیە ـ سەد یەکێکی کەمە ـ هەرکەس لە بەریان بکات دەچێتە بەهەشتەوە ، خوا تاکەو تاکی خۆش دەوێ..

وە لە ریوایەتێکی بوخاریدا دەفەرموێ : هەرکەس بیانژمێرێ دەچێتە بەهە شتەوە. (ترمذی) ئەوەی ئەوانی ریوایەتکردووە و زیاد لەوانیش ناوەکانی بەم جۆرە باسکردووە::

« هوالله الذي لااله الاهو،الرحمن ،الرحيم ،الملك ،القدوس، السلام ،المؤمن ،المهيمن ،العزيز،الجبار،المتكبر،الخالق ، البارئ ، المصور،الغفار،القهار،الوهاب ،الرزاق ،الفتاح ، العليم ، القابض ،الباسط ،الخافض ،الرافع،المعز ،المذل ،السميع ،البصير ،الحكم ،العدل ،اللطيف ،الخبير،الحليم، العظيم ،الغفور، الشكور ،العلي،الكبير ،الحفيظ ،المقيت ،الحسيب ،الجليل ،الكريم ، الرقيب ،المجيب ،الواسع ،الحكيم ،الودود ،المجيد ،الباعث ، الشهيد ،الحق ،الوكيل ،القوي،المتين،الولي،الحميد ،المحصي ، المبدئ ،المعيد ،المحي ،المميت ،الحي ،القيوم ،الواجد ،الماجد ، الواحد ،الصمد ،القادر،المقتدر،المقدم ،المؤخر ،الاول ،الآخر ، الظاهر ،الباطن ،الوالي ،المتعالي ،البر،التواب ،المنتقم ،العفو،

**الرؤف ، مالك الملك ، ذوالجلال والإكرام ، المقسط ، الجامع ، الغني ، المغني ، المانع ، الضار ، النافع ، النور ، الهادي ، البديع ، الباقي ، الوارث ، الرشيد ، الصبور »** ..

### واتای هەندێ لە ناوە پیرۆزەکان :

**«القدوس»** پاك لە هەموو عەیبێك . **«السلام»** ئەمان بە مەخلوقاتی خۆی دەدات ، یاخۆی دوورە لەهەموو عەیبێك . **«المؤمن»** بەڵێنی خۆی بۆ مەخلوقاتی دێنێتەدی ، لە عەزاب ئەمینیان دەکاتە وە . **«المهیمن»** دەسەڵاتدارو بەتوانا ، یا ئاگادارو چاودێرە . **«العزیز»** زاڵو تێشکێنەری نەبەزیو . **«الجبار»** بەجێهێنەری فەرمانەکانیەتی ، **«المتکبر»** باڵاترە لەوەی صیفاتی مەخلوقی ببێ ، تاکانەیە لە صیفەتە مەزنەکانیشیا . **«الباریٔ»** خولقێنەر ، بەڵام زیاتر بۆ بەدیهێنانی گیانداران بەکاردەهێنرێ و دەگوترێ : خوا **«باریٔ النسم ، وخالق السموات و الارض»** ، واتە : خوا خولقێنەری هەموو گیانداران و بەدیهێنەری ئاسمانان و زەوییە . **«المقیت»** زانای ئاگادار . **«الحسیب»** چاودێری کردەوەی بەندەکانیەتی و لێیان دەپرسێتەوەو پاداشتی مەخلوقاتی خۆی دەداتەوە .

**«المحصي»** ئەوەی هەموو شتێکی بە عیلمی خۆی ژماردووە و هیچی لێ ون نابێ . **«البر»** بە چاکە و لوتفی خۆی سۆزی بۆ بەندەکانی هەیە . **«المقسط»** دادگەر و عادلە لە حوکمیا . **«الرشید»**

ریّ پیشانده‌ری مه‌خلوقاته بۆ (مه‌صله‌حه‌ت) و به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانیـان «والصبور» بۆ تۆڵه سه‌ندنه‌وه له یاخی بووان په‌له ناکات ..

***

چه‌ند باسێك په‌یوه‌ندییان به ناوه پیرۆزه‌کانه‌وه هه‌یه :

### ئه‌و ناوانه‌ی له نه‌وه‌د و نۆ ناوه‌که زیاترن :

وه نه‌بێ له باره‌ی ناوه پیرۆزه‌کانه‌وه ته‌نیا ئه‌و نه‌وه‌د و نۆ ناوه هاتبێ و باسکرابێ ، به‌لکو له چه‌ند فه‌رمووده‌یه‌کی ترا چه‌ند ناوێکی تر جگه له‌و نه‌وه‌د و نۆ ناوه باسکراون .. هه‌ر له‌و فه‌رمووده‌یه‌دا که (ترمذی) ی ده‌یگێڕێته‌وه ،له ریوایه‌تێکی تریا ئه‌م سێ نـاوه‌ی تریـش باسکراوه :« الحنان » و« المنان » و« البدیع ».وه هه‌روه‌ها چه‌ند ناوێکی ترله ناوه‌کانی خوای ته‌عالا به‌م جۆره باسکراون: « المغیث » و« الکفیل » و« ذوالطول » و« ذو المعارج » و« ذوالفضل » و« الخلاق » ..

ئه‌بوبه‌کری (ئیبنو عه‌ره‌بی) له شه‌رحی (ترمذی) دا به‌ده‌م هه‌ندێ له ئه‌هلی عیلمه‌وه ده‌گێڕێته‌وه وده‌لێ: که، هه‌زار ناو له ناوه‌کانی خوای ته‌عالای له قورئان وسوننه‌تا کۆ کردۆته‌وه . وه له قسه‌کانی خاوه‌نی کتێبی (القصد المجرد) ا پشتگیرییه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی ئیبنو عه‌ره‌بی هه‌یه. وه (شه‌وکانی) ش له کتێبی (تحفة الذاکرین) دا هێمایه‌کی بۆ ئه‌و قسه‌یه کردووه ، به‌لام باشترین و دیاری ترین شتێ له باره‌ی سه‌رژمێری ناوه‌کانه وه ئه‌و فه‌رمووده‌یه که (ترمذی) ده‌یگێڕێته‌وه‌و باسمانـکرد ، چونکـه

بەشی کیفایەتی تیدایە ..

***

**چەند وشەیەك لەوە دەچێ ناوی خوای تەعالا بێ:**

دوای ئەمڕوونکردنەوەیە ئەوەش بزانە: کە هەندێ لەفەرموودە کان چەند وشەیەکیان تیا باسکراوە کە گوایا لە ناوە پیرۆزەکانن . بەڵام ئەوەی لەحاڵ و وەزعی قسەکانەوە وەردەگیرێ شتێکی تر دەگەیەنێ نەك ئەوە. ئەوەش بزانە، کە ئەو ناوانە لە بابەتی مەجازن نەك حەقیقەت . وە لە جۆری ناو بردنی شتێ بەناوی غەیری خۆیانەوە، بە هۆی پەیوەندییەك کە لە نێوانیانا هەیە، یا هەندێ وشەی قرتێنراوی بۆ دادەنرێ . بۆ نموونە :

ئەم فەرموودەیەی کە ئەبووهورەیرە لە پێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ ریوایەتی دەکات و فەرموویەتی: « **لاتسبوا الدهر فإن الله هو الدهر** » رواه مسلم. واتە: ئێوە جنێو بە دەهر {ڕۆژگار} مەدەن چونکە خوا خۆی دەهرە ..

یا ئەو فەرموودەیەی کە حەزرەتی عائیشە ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ ریوایەتی دەکات : « **دعوه يئن فإن الأنين إسم من اسماء الله تعالى يستريح إليه المريض** » واتە : وازی لێبێنن بناڵێنێ ، چونکە ناڵە ناڵ « أنين » ناوێکە لە ناوەکانی خوای تەعالا و نەخۆشی پێی ئاسوودە دەبێ ..

جەلالوددینی سیوتی {جلال الدين السيوطي} لە کتێبی ئەلجامیعول سەغیر {الجامع الصغير} دا باسی کردووە و لە {را فیعی} یـەوە وەری گرتووە و بە جوان {حسن} ی داناوە . ئەم فەرموودەیە ریوایەتی موسلیم نییە ، وە هەروەها لە ریـوا یەتی فـەرموودەکەی ئە بـوو هورەیرەش نییە ، هەروەك هەندێ کەس تیایا بە هەلەدا چوون ..

وە یەکێکی تر لەم بابەتە ئەوەیە کە ناوی رەمەزانیان لە هەندێ شوێنەواردا بەسەر خوای تەبارەك وە تەعالادا بڕیوە .. لە هەموو ئە مانەدا تەنیا روالەت مەبەست نییە، بەلکو مەبەست شتێکی ترە، بۆ نموونە:لە فەرموودەی یەکەمدا مەبەست ئەوە یە کە هۆی سەرەکی رووداوەکانی رۆژگار {الدهر} خوای تەعالایە و دروست نییە هیچ شتێك بدرێتە پالّ رۆژگار، کەوابوو نابێ جنێویشی پێ بدرێ و نابێ سەرزەنشت بکرێ ..

وە لە فەرموودەکەی دووەمدا مەبەست ئەوەیە کە نالـە نالّ شوێنەواری زالبوون وقەهری خودایە و نەخۆش پێی ئاسوودە دەبێ. وە هەروەها ئەو شتانەی تریش کە بەپێی حالّ و قەرینە واتایەکی تر دەگەیەنن ، چەند وشەیەکیان بۆ تەقدیر دەکرێ ..

***

## وەستان لە بەرامبەر ناوو صیفەتەکانی خوای تەعالاوە :

ئەوە بزانە کە جەماوەری موسلمانان یەکڕان لە وەدا کە دروست نییە ناوێك یاصیفە تێك شەرع نەیهێنابێ و ئێمە لە خۆمانەوە بۆی دابنێین بەونیازەی بیکەین بەناو بۆ خوای تەعالا.. هەرچەند ئەو ناوە بێ کەم و کووڕیش پیشان بدات و کەمالێ بگەیەنێت .

بۆ نموونە : دروست نییە بە خوای تـەعالا بڵێین : موهەندیسی هەرە مەزنی بوونەوەر. یابڵێین : بەڕێوەبـەری گشتی بۆ کاروباری مەخلوقات . کە گوا یا ئەمانە ناو یا صیفەت بن بۆ خوای تەعالا و بکرێنە زاراوە { مصطلح } بۆی ، وە پێك بێین لەسەر بەکار هێنانیان بۆ خوای تەعالا، شتی وا ناشێ و دروست نییە ..

بەڵام ئەگەر ئەو جۆرە دەستە واژ{عبارة }انە لە ناو باسی قسەدا هاتن بۆ روونکردنەوە و دەرخستنی دەسەڵات وتواناییخوا ومەبەست نموونە و نزیك کردنەوەی توانای خوابوو لە تێگەیشتنی خەڵکییەوە ، ئەوە قەیدی نییە وگوناهباری تیا نییە، هە رچەند بەکار نەهێنانیان باشـترە لـە بـەکارهـێنانیـان ، تا بـەئەدەب بـوون لـە بـەرامـبـەر حەقتەعالاوە پیشان بدرێت ..

***

## ناوی دیاریکراو و صیفەت لەم ناوانەدا :

ئەو ناوانەی لەوەپێش باسکران تەنیا یەك ناویان تێدایە کە عەلەم {علم} بیت بۆ زاتی موبارەکی حەقتەعالا، ئەویش وشەی بەڕێزی {الله} یە، ئیتر هەموو ناوەکانی تر زیاترواتای ناوەڵناوی وصیفەتیان تیا رەچاو دەکرێت ..

لە بەر ئەوە لە بارەی زمانەوانییەوە دەبینین دروستن ببنە خەبەر بۆ وشەی{الله}،بۆ نموونە بگوترێ:«الله عالم ،او الله رازق..الخ» ئایا ئەو ناوانە {موشتەق} یا{جامید}ن ؟ ئەوە مەسەلەیەکە و زانایان لە وبارەوە رایان جیاوازە تیایدا. وەنەبێ کارێکی کردەوە یی {عملی} لەسەر بنیات بنرێ ، ئەوەمان بەسە کە بزانین تەنیا ناوی «الله» ناوە بۆ خودی خوای تەعالا و ناوە کانی تر تێکەڵ بە ناوەڵناویەتی و صیفەتن .لە وبارەوە ئەوەندەش بەسە ..

* * *

## تایبەتمەندی ناوە پیرۆزەکان :

هەندێك وایاس دەکەن کە بۆ هەموو ناوێك لە ناوەکانی خوا چەند تایبەتمەندی و نهێنییەك هەیە وکەم یا زۆر پەیوەندییان پێوەی هەیە .. هەندێك تەواو لە سنوور تێدەپەڕن و دەڵێن وێییان

وایە : هەموو ناوێك خزمەتكارێكی رۆحانی هەیە و خزمەتی ئەوانە دەكەن كەلە ناوبردنی ئەو ناوانەدا بەردەوامن و...هەروەها.

ئەوەی منیش لەو بارەوە ئاگادارییم و پێی بزانم - لە زۆربەی هەموو زانایەكەوە زاناترێك هەیە ـ ئەوەیە كە: ناوە پیرۆزەكانی خوا،كۆمەڵە وشەیەكی پیرۆزن و رێزیان بەسەر هەموو وشە و قسەیەكی ترا هەیە پەیڕەوكەتن و باسكردن و ناو بردنیان پاداشتێكی زۆری لەسەرە .
ئەگەر ئینسان لەسەر یادی خوا بەردەوام بێ دەروونی پاك دەبێتەوە و رۆحی بێخەوش دەبێ ، بە تایبەت ئەگەر یادكردن و ناو بردنەكە بە ئاگاداری دڵ و تێگەیشتنی مەعناكەیەوە بێت ، ئەمما لەوە زیاتر نە لەقورئانا هاتووە و نە لەسوننەتا ، ئێمەش رێی زیادەڕەوی و زیاد كردنمان لەدینی خوادا پێ نەدراوە ، بەڵكو نەهیشمان لێكراوە ،كەوابوو ئەوەندەمان بەسە كە لەقورئان و سوننەتا باسكراوە .

***

## مەزنترین ناوی خوا «اسم الله الأعظم» :

باسی مەزنترین ناوی خوا لە چەندەها فەرموودەدا باسكراوە لەوانە : ١- بورەیدە (بریدة) ـ خوا لێی رازی بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وآلەوسلم ـ گوێی لە پیاوێكەوە بوو دوعای دەكرد و دەیگوت : [ «اللهم اني أسالك بأ ني أ شهد أنك أنت الله، لا اله الا أ نت ، الاحد الصمد ، الذي لم يلد ولم يولد، ولم

*يكن له كفوا أحد ، قال : فقال النبي : والذي نفسي بيده لقد سأل الله بإ سمه الأعظم الذي إذا دعي به أجاب ، وإذا سئل به أعطى »*(١)

واته : ئەی خودایە ، داوات لێدەکەم و وەسیلەم بۆ گیرابوونی داواکەم ئەمەیە ،کە : شایەتی دەدەم خودی خۆت خودایت و جگە لەتۆ خودایەکی ترنییە ، وە ئەو تا قانە خودایەیت کە لە کاتی پێویستیدا هاناو پەنات بۆ دەبرێت و بێ ئیحتیاجیت ، ئەو خودایەی کەسی لێ نەبوە و لە کەسیش نەبوە ، وەهیچ شتێکیش هاوتاو وێنەی ئەو نییە . بورەیدە دەڵێ : پێغەمبەر- صلى الله عليه وآله وسلم - فەرمووی : سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە : بە مەزنترین ناوی خوا داوای لەخواکرد ، ئەو مەزنترین ناوەی ئەگەر دوعای پێبکرێ گیرا دەبێت و داوای پێبکرێت پێی دەبەخشرێت و بێبەش ناکرێ. » ئیبنو حەجەر (ابن حجر) گوتویەتی : ئەم فەرمودەیە لە بارەی سەنەدەوە باشترین و بالآترینی ئەو فەرموودانەیە کە لەم بارەوە باسکرابێ .

٢-ئەنەسی کوڕی مالیك ـ خوا لێی رازی بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ـ

---

١ـ رواه أبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجة. وقال المنذري: قال شيخنا: أبو الحسن المقدسي: هو اسناد لا مطعن فيه، ولا اعلم انه روي في هذا الباب حديث اجود اسنادا منه، وقال الحافظ ابن حجر: هذا الحديث ارجح ما ورد في هذا الباب من حيث السند

صلى الله عليه وآله وسلم ـ رۆیشتە مزگەوتەوە و پیاوێك نوێژی خوێندبوو دوعای دەکردو دەپاڕایەوە ، لە دوعاکەیا دەیگوت: « **اللهم ، لا إله إلا الله ، أنت المنان ، بديع السماوات والأرض ، ذوالجلال والإكرام - فقال النبي -** صلى الله عليه وآله وسلم ـ **أ تدرون بم دعا الله ؟ دعا الله باسمه الأعظم الذي إذادعي به أجاب ، وإذا سئل به أعطى** » رواه أبوداودوالترمذي والنسائي وابن ماجة .

واتە : ئەی خوایە، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تر نییە ، تۆ خاوەن چاکەو نیعمەتی فراوانی . بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانانی ، خاوەنی گەورەیی و دەسەڵات وڕێزی » پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ فەرمووی : « دەزانن بەچی لەخوا پاڕایەوە و دوعای کرد ؟ بەمەزنترین ناوی خوا لە خوا پاڕایەوە ، ئەو مەزنترین ناوەی ئەگەردوعای پێ بکرێ گیرادەبێت و گەر داوای پێ بکرێ پێی دەدرێت. »

٣ -ئەسمای کچی یەزید ـخوا لێی ڕازی بێ ـ دەڵێ : بیستم کە پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ فەرمووی: **(اسم الله الأعظم في هاتين الآيتين : ( وإلهكم إله واحد لا إله الا هو الرحمن الرحيم ) و فاتحة آل عمران ( الم ، الله لا إله إلا هو الحي القيوم. )** رواه احمد وأبو دود والترمذي وابن ماجة وقال الترمذي حديث حسن صحيح.

واتە:مەزنترین ناوی خوا ، لەم دوو ئایەتدایە:ـکەئەمەواتا کانیانە « خوای ئێوە خوایەکی تەنیایە هیچ خوایەکی ترنییە جگە لەو، ئەویش

بەخشندەی میهرەبانە» وە لە سەرەتای سوورەتی ئالی عیمرانەوە«ئەلیف ،لام ،میم ، الله ، ئەو خودایە ، کە هیچ خوایەکی تر نییە جگە لە خۆی ، وە زیندووی ئەزەلییە و سەرپەرشتی بوونەوەرە»

٤ـ سەعدی کوڕی مالیك ـ خوالێی رازی بێ ـ دەڵێ: بیستم کە پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ دەیفەرموو: «هل أدلكم على إسم الله الأعظم الذي إذا دعي به أجاب ، وإذا سئل به أعطى ؟ الدعوة التي دعا بها يونس حيث نادى في الظلمات الثلاث :لاإله الا أنت ، سبحانك ، إني كنت من الظالمين فقال رجل : يا رسو ل الله، هل كانت ليونس خاصة ؟أم للمؤمنين عامة ؟ فقال رسول الله ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ : ألا تسمع قول الله عزوجل :ـ فنجيناه من الغم وكذلك ننجي المؤمنين ـ» رواه الحاكم .

واتە : ئایا مەزنترین ناوی خواتان پێبڵێم ، ئەوناوەی ئەگەر دوعای پێبکرێت گیرادەبێت و ئەگەر داوای پێبکرێت پێی دەدرێت ؟ ئەو مەزنترین ناوە ئەوەیە کە یونس دوعای پێکردو لە هەرسێ تاریکییەکە(ی ناوسکی حووت و دەریا و شەو) رزگاری بوو ،کاتێ پاڕایەوە و گوتی : ئەی خوایە ، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تر نییە ، تۆ پاك ومونەززەهی ، من خۆم لە ستەمکاران بووم و زولمم لەخۆمکرد.ـ پیاوێکیش گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئەو

دوعایه هەر بەتایەت بۆ یونس بووە ؟ یا بۆ هەموو ئیماندارانە بەگشتی؟؟ پێغەمبەر - صلی الله علیه وآله وسلم - فەرمووی : ئایا گوێت لێ نییە کە خوای تەعالا دەفەرموێ : «ئێمەش لەخەم رزگارمان کرد و ئاوهایش ئیمانداران رزگار دەکەین » ؟؟

کاتێ سەرنجی ئەم فەرموودانە و جگە لە مانەیش دەدەیت ئەوە دەبینیت کە بەشێوەیەکی تایبەت خودی مەزنترین ناو دیاری نەکراوە .. وە زانایانیش بە پێی جیاوازی دەلیلەکانیان و بە پێی ساقبوونە وە ی فە رموودە کان لە لایان ، لە بارە ی دیا ریکردنی مە زنترین ناوە وە رای جیاوازو جیاجیان هە یە و دە گاتە نزیکەی چل رایەك ..

ئەوەی ئێمە لەم فە رموودە پیرۆزانەوە و لە رای زانایانی بڕوا پێکراوی نەتەوەی ئیسلامییەوە وەری‌دەگرین ئەوەیە ، کە : مە زنترین ناوی خوا (إسم الله الأعظم) دوعایەکە پێکهاتوو لەچەند ناوێك لە ناوەکانی خوای تەعالا ، ئەگەر ئینسان دوعای پێ‌بکات ـ لەگەڵ هەل و مەرجی پێویستی دوعا گیرا بووندا ـ خوای تەعالا دوعاکەی گیرا دەکات . ئەمەش لە چەندەها جێ و لە چەندەها فەرموودەی پیرۆزدا راگەیەنراوە ..

ئەگەر ئەم بۆ چوونەمان سەلماند و ئەم حەقیقەتەمان لە لاجێگیربوو ، ئیتر ئەوەی کەهەندێ کەس لەم بارەوە دەیلێت و

دروستی دەکات  کە گوایا رازێکە  لە رازەکان «سر من الأسرار» و توانایيەکی عەجیب  بەهەندێ کەس دەبەخشێت و تەلیسمی پێدەشکێنن و داخراوەکانی  پێدە کەنەوە وکاری موعجیزە ئاسای پێئەنجام دەدەن و تایبەتمەندییەکیان  پێدەبەخشێت کە بۆ جگە لەوان نەبێت و دەست  نەدات ..

ئەمانە هەموویان زیادەن  نە خوا شتی وای فەرمووە و نە پێغەمبەرەکەی ، ئەگەر هەندێ کەس بەلگە بەوئایەتە پیرۆزە دێننەوە کەدەفەرموێ : «*قال الذي عنده علم من الكتاب : أنا آتيك به قبل أن يرتد إليك طرفك*»(١)النمل / ٤٠. کە گوایا ( *عنده علم من الكتاب*) مەزنترین ناوی خوای لە بەربووە ، ئێمەش پێیان دەلێین :تەفسیر زانەکان دەلێن : دوعای ئەو  پیاوچاکەی مەجلیسەکە بە وشەی{ *ياحي ويالقيوم* }، یان:{*الله لاإله إلا هو الحي القيوم* } بووە ، وە هەندێکیشیان  ئیددیعایان  وایە : کە دوعاکە بەزمانی سورە یيانی بووە ، گوتویەتی:{ ئاهيا ،شەراهيا}  ئـەم قسـانـەش دەعوا ی  بێ دەلیلن، کە وابوو مەزنترین  ناوی‌خوا هەر ئەوە یە کەلەو فەرموودە ساغ و دروستانەدا باسکراوە و لەوانە دەرناچێ ..

پوختەی باسەکە ئەوە یە  : هەندێ کەس لە مەتەڵ و لەغەزو

---

١-واتە: ئەوەی زانیارییەکی لەکتێبدا هەبوو گوتی:پێش ئەوەی تۆ چاو بەیەکدا بنێیت من بۆت دێنم.

موعەمادا رۆچوون و لەئیدیعای تایبەتمەندیدا و زیاتر گوتن لەوەی کە لەمەئسوورات (مأثورات)دا باسکراوە، جا لەبەر ئەوە شتیوا دەڵێین نەقورئان باسیکردووە و نەسوننەت. ئێمەش بە توندی نەهیمان لێکراوە لەو شتانە و دەبێ لەگەڵ ئەو شتانەدا بین کە لە(مەئسوور)دا هەیە

***

## صیفەتەکانی خوای تەعالا :

تۆکاتێ سەرنجی ئەم بوونەوەرەوحیکمەتە بێ هاوتاکانی دەدەیت ، و ئەو مەخلوقاتە عەجیبانە و وردەکاری لە دروستکردنیاندا دەبینی ، وە ئەو جوانکارییە مەحکەمە دەبینیت لەگەڵ گەورەیی وفراوانی یەکخستن وهونەرکاری و نوێکردنەوە و داهێنان و بەدیهێنانەی تێیداکراوە ،وە ئەو ئاسمانە پاکە هەساوە بە ئەستێرە و گەردوونەکانیەوە بە خۆرو مانگ و خولگەکانیانەوە دەبینیت، وە ئەو زەویە دەبینیت بەرووەك و خێراتیەوە ، بە کانزاو گە نجینە و خەزێنەکانیەوە ، بە توخم و رەگەزو شتەکانیەوە ، وە جیهانی گیانداران دە بینیت و ئەو هە موو عەجایباتەی لە ناو ئەواندا هەیە، وەك رێنموونیکردن و نیگاو ئیلهامێك کە لەژیانی رۆژانەیاندا دەبینرێت . بەڵکو ئەگەر دەبینیت کە ئادەمیزاد چۆن پێکهاتووە لە و هەموو دەزگا فراوانەی جوستەی و چۆن هەریەکەیان کاری خۆی

دەکات و وەزیفەی خۆی ئەنجام دەدات ، سەرت سوور دەمێنێ ..

وەئەگەر جیهانی دەریاکان دەبینی لەگەڵ ئەوهەموو شتە سەیر و سەر سوورهێنەرانەی کە لەوێدا هەیە، وە ئەگەرهێزەکانی بوونەوەرت ناسی و ئەوحیکمەت ونهێنییانەش کە تێیاندایە ، وەك کارەباو موگناتیس و ئەسیر ورادیۆم ..

پاشان ئەگەر سەرنجت گواستەوە بۆ ئەو هەموو عالەمەی ترو صیفەتەکانیان ، بۆ پەیوەندی وعەلاقەی نێوانیان ، چۆن هەریەکەیان بە جۆرێکی مەحکەم و پتەو پەیوەندە بەوی تریانەوە ، بە جۆرێك لە هەموویاندا یەکیەتییەکی بوونەوەری پێك دێت و هەروەك چۆن ئەندامەکانی لەش خزمەتی هەموو ئەندامەکانی تری دەکات ، ئاوهایش هەر بەشێکی ئەوان خزمەتی ئەو بەشەکەی تریان دەکەن ..

کاتێ ئاوەها سەرنجتداو ورد بوویتەوە ، بێ ئەوەی بەلگەو دەلیلێك ، یا وەحی و قور ئانێکت بۆ بێت ، سەرت لەم عەقیدە و بیرو باوەڕە ئاسانەوە دەردەچێت و دەڵێیت : ئەم بوونەوەرە وەستاو خولقێنەرو بەدیهێنەرێکی هەیە ، وە ئەم وەستاو بەدیهێنەرەش دەبێ زۆر لەوە بەتوانا تربێ کە ئینسان لەواتای تواناوە دەرکی دەکات، وە دەبێ زیندوو بێ بە کاملترین واتای ژیان و زیندوو بی ، وە دەبێ پێویستی بە هیچ مەخلوقاتێکی نە بێ ، چو نکە ئەوبووە ، پێش ئەوەی ئەوان بێن ، وەدە بێ زانابێ بە فراوانترین سنووری زانیاری،

وە دەبێ لە زوور باساکانی بوونەوەرەوە بێ چونکە خۆی ئەوانی بەدیهێناوە . وە دەبێ لە درای هەموویشیانەوەبێ ، چونکە خۆی حوکم بە نەمانیان دەکات ..

بە کورتی پاش ئەم سەرنجدان و وردبوونەوەیە دەروونت دەبینی پڕبووە لەباوەڕ ، دەزانیت کە وەستاو تەگبیرکەری ئەم بوونەوەرە هەموو صیفەتێکی کەماڵ و تەواوی هەیە و لە زوور بۆ چوون و (تصور)ی عەقلی بچووکی نادەمیزادەوەیە . وە پاك و(مونەززەهە) لە هەموو کەموکووڕی و صیفەتێکی ناتەواویەتی ..

بەڵێ، بەم جۆرە دەبینیت ئەم عەقیدەیە دەبێتە وەحی لە ویژدانتەوە بۆ ویژدانت .. وەهەستی دەروونت دەبێ بۆ دەروونت ، ***« فطرة الله التی فطر الناس علیها ، لا تبدیل لخلق الله ذلك الدین القیم »*** الروم / ٣٠ .

ئەمە ئەو سروشتەیە کە خوا لە ناخی خەڵکیدا دروستی کردووە ، ئێوەش هەوڵ بۆ گۆڕینی ئەو سروشتە مەدەن و هاوبەش بۆ خوا پەیدا مەکە ن ، ئەو یەکتا پەرستییەی من فەرمانتان پێدەکەم دینی راست و بێ پێچ و پەنایە .

پاش ئەم پێشەکییە ، دەمەوێ هەندێ لە رووداوە سەیرو عەجیبەکانی ئەم بوونەوەرەت بۆ باس کەم ، هەرچەند بە نیسبەت ئەم بوونەوەرە گەورەیەو ووردەکاری و نەزم و تەرتیبیەوە ئەو رووداوانە

زۆرکەمن ، بەڵام لەگەڵ کەمیشیاندا دەبینیت بەسن بۆ ئەوەی لە دەروونی خۆتا هەست بەوە بکەیت کە من پێشکەشم کردیت ..

**سەرنجی یەکەم :**

ئەم هەوایەی ئێمە هەڵی دەمژین لە چەندەها توخمی ئاوێتە پێکهاتووە ، کە دوو توخمیان سەرەکین ، بەشێکیان بۆ هەناسەدانی ئینسان دەگونجێ و لە زاراوەی کیمیاییەکاندا پێی دەگوترێ: ئۆکسجین ، ئەو بەشەکەی تریشیان کە ئینسان پێی ناژی پێی دەگوترێ : دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ، یەکێك لەو وردەکارییە موعجیزە ناسایەی کە لە پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی ئەم بوونەوەرەدا هەیە ئەوەیە : ئەو بەشەی کە بۆ ئادەمیزاد و گیانداران زیانبەخشە ، رووەك هەڵی دەمژێ و سوود بەخشە بۆی ا لەکاتێکا ئینسان ئۆکسجین هەڵدەمژێ و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەکاتە دەرەوە ، رووەك بە پێچەوانەوە کاردەکات ، واتە: کاربۆن هەڵدەمژێ و ئۆکسجین دەکاتە دەرەوە ا جا سەرنج بدەرە ئەم پەیوەندییەی هاریکاری نێوان رووەك و گیانلەبەران ( إنسان و نبات) ا لە شتێکا کە گرنگترین ماددەیە بۆ ژیانی هەردوو لایان ، کە ئەویش هەناسەدانە .

ئینجا پێم بڵێ ، ئایا جگە لە مەزنێکی گەورەی زانیاری فراوانی وردەکار لەحیکمەتیا کێ دەتوانێ لەم بوونەوەرە گەورەیەدا شتی وا ئەنجام بدات ؟!

**سەرنجی دووەم :**

ئەو خواردنەی تۆ دەیخۆیت لە چەند رەگەزی رووەکی (نەباتی) یا گیانداری {حەیوانی} پێکهاتووە ، زانایان بەم جۆرە دابەشی دەکەن بۆ ماددەی : پرۆ تینی ، یا نیشاستەیی ، یا چەوری . بۆ نموونە : دەبینی لیکی ناودەم هەندێ لە ماددە نیشاستەیی و شەکرییەکان هەزم دەکات و ئەوانەی تریش کە قابیلی توانەوەی خێرابن دەیانتوێنێتەوە ، گەدە (معدة) یش هەندێ لە ماددە پرۆتینییەکانی وەك : گۆشت و شتانێکی تر هەزم دەکات ، ئەو زەرداوەی کە لە جگەرەوە دەردەچێت چەورییەکان هەزم دەکات و شیتەلیان دەکات و ئەوەندە وردیان دەکات بگونجێن بۆ ئەوەی موولوولەکانی ریخۆلە هەلیانمژن ، دوای ئەوە نۆرەی پەنکریاسە ، ئەویش چوار جۆرە ترشی دەردەدات و هەریەکەی کارێك ئەنجام دەدات ، سیانیان هەرس و هەزمی ئەو ماددانە دەکەن کە هێشتا تەواو هەزم نەبوون ، چوارەمیشیان شیر دەکاتە پەنیر . ئینجا خۆت لەم پەیوەندییە عەجیبەی نێوان ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و رەگەز و توخمەکانی رووەك و گیانداران و ئەو خواردنەی ئینسان دەیخوات ورد ببەوە و لەم پەیوەندییەی نێوانیان بیبیر بکەرەوە ..

***

سەرنجی سێ هەم :

گوڵی ئەو رووەکە دەبینی کە چەند پەڕێکی جوان و سەرنج ڕاکێشی ـ بەجوانترین رەنگ ـ رەنگکراوی هەیە ، ئەگەر لە بارەی حیکمەت و هۆی دروستبوونی ئەو گوڵە رەنگجوانەوە لەزانایانی رووەکناست پرسی لە وەڵامتا دەڵێن: ئەوەکەمەندکێشە بۆ هەنگ و هارچەشنەکانی ، ئەوانەی بۆنی گوڵ هەڵدەمژن ، تا بەرەو گوڵەکە بێن و لەسەری بنیشنەوە ، کاتێ کە بەسەر داری گوڵەکەوە وەستان دەنکە تۆوی نێرینەیان بە پێوە بلکێ و لەگوڵی نێرینەوە بیبەن بۆ گوڵی مێینەو بەو جۆرە پیتێن (تلقیح) لە نێوانیانا دروست ببێ !!

جا سەرنج بدە چۆن ئەو پەڕە جوانانە لە گوڵدا کراونەتە ئەلقەی بە یەککەیشتن لە نێوان رووەك و گیانداراندا ، تا رووەك گیاندار بەکاربێنێ لە کرداری پیتێندا کە بۆ بەرهەم و بەرو بووم زۆر پێویستە !!

هەرچی والەم بوونەوەرەدا باسی حیکمەتێکی باڵا و ویستێکی بەرز و دەسەڵاتێکی بەهێز دەکەن ، کە لەو پەڕی وردەکاری و پتەویدان و ئەم بوونەوەرەیان لە سەر دەچێ بەرێوە . پەروەردگاری ئەو حیکمەتە و خاوەنی ئەو مەزنی و گەورەییە و دانەری ئەو دەستوور و یاسایانە (الله) یە ..

قورئان لەو بارەوە بە خەستی باس دەكات و سەرنجی خەڵكی بۆ ئەو حیكمەتە ناوازە و نهێنییە بەرزانە رادەكێشێ و لەوانەیە بڵێم هیچ سوورەتێك نییە لەناو سوورەتەكانی قورئاندا باسی بەهرە و نیعمەتەكانی خوای تیا نەبێت و كار بەجێ یی و توانایی خوای تیا پیشان نەدرابێ و خەڵكی بۆ دووبارە سەرنجدان هان نەدابێ . بەڵێ ، داوای لێكردوون تا لەبیبیركردنەوەی بەردەوامدا بن ..

خوای تەعالا دەفەرموێ :« ومن آياته أن خلقكم من تراب،ثم إذا أنتم بشر تنتشرون، ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا لتسكنوا إليها وجعل بينكم مودة ورحمة ، إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون ، ومن آياته خلق السموات والارض واختلاف ألسنتكم وألوانكم ، إن في ذلك لآيات للعالمين ، ومن آياته منامكم بالليل والنهار وابتغاؤكم من فضله ، إن في ذلك لآيات لقوم يسمعون ، ومن آياته يريكم البرق خوفا وطمعا وينزل من السماء ماء فيحيي به الارض بعد موتها، إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون»الروم/ ٢٠- ٢٤..

واتە: یەكێك لە نیشانەكانی بوونی خوداو دەسەڵاتی بێ سنووری ئەوە یە ، كە : ئێوەی لە خاك دروستكردووە - راستەوخۆ وەك دروستكردنی ئادەم ، یا ناراستەو خۆ وەك خواردن و خۆراكێك كە هۆی بوون و گەشەكردنی ئینسانە و لە خاك پەیدا دەبێت -،

پاش ئەوە کە خوا دروستی کردن ، مرۆڤێکن و بە سەر زەویدا بلاوە دەکەن بۆ کاروانی و ژیواری پەیداکردن و چەندەها شتی تریش ..

یەکێکی تر لە نیشانەکانی خوا کە توانای زیندوو کردنەوە و گەڕاندنەوەی ئێوەی هەیە ئەوەیە ،کە: لە رەگەزو جنسی خۆتان هاوسەری بۆ دروستکردوون تا هۆگریان بین ، وە خۆشەویستی ودلۆڤانی خستۆتە نێوانتانەوە تا ژیانی خێزانی بەردەوام بێت و بەڕێکی بڕوات بەڕێوە ، ئا لەوانەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی بیبیر بکەنەوە ..

یەکێکی تر لە نیشانەکانی دەسەلات و توانایی خوا دروستکردنی ئاسمانان و زەویە ، وە جیاوازی زمان و رەنگتانە ، بێگومان ئا لەوەدا دەلیل و بەلگە بۆ ئەو زانایانە هەیە کە لە دروستکراوەکانی خوا بیبیر دەکەنەوە ..

یەکێکی تر لە نیشانە کانی دەسەلاتی خوا: خەوتانە بە شەودا و پشوودان و ئارامبوونتانە تیایا،وە هەولدان و تێکۆشانتانە بۆ رزق و ژیواری لە رۆژا ، بێگومان ئالەو ئایەتانەدا ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی ببیستن ..

یەکێکی تر لە نیشانەکانی تواناو دەسەلاتی بێ سنووری خوا ئەوەیە کە بروسکەتان پیشان دەدات ، لە لایەکەوە دەترسن مەبادا بتانسووتێنێ ، لە لایەکی ترەوە تەماحی خێرتان پێیەتی بەلکو

باران و ڕێژەنی پێبێت بۆکشت و کاڵتان ..

وە لەئاسمان و لای ژووررووتانەوە باران دەبارێنێ و زەوی مردووی پێ زیندوو دەکاتەوە ، بێگومان ئا لەوەدا چەندەها نیشانە هەیە لەسەر زیندووکردنەوە و بەرپابوونی دوارۆژ بۆ ئەو کەسانەی عەقلیان بەکار بێنن ..

وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: ***والله الذي يرسل الرياح فتثير سحابا فيبسطه في السماء كيف يشاء ويجعله كسفا فترى الودق يخرج من خلاله فإذا أصاب به من يشاء من عباده إذاهم يستبشرون . وإن كانوا من قبل أن ينزل عليهم من قبله لمبلسين . فانظر إلى آثار رحمة الله كيف يحيى الأرض بعد موتها إن ذلك لمحيى الموتى وهو على كل شئ قدير*** «الروم/٤٨-٥٠». واتە : خوا ئەو خودایە با دەنێرێ و هەوری پێدروست دەکات و چۆنی بوێت بلاّوەی پێدە کات و لە رووی ئاسمانا کۆی دەکاتەوە ، دە بینی باران لە ناو هەورەوە دەبارێنێ ، ئەگەر بەرهەندێ کەس لەو عەبدانەی خوا کەوت کە خۆی دەیەوێ پێی کەیف خۆش دەبن ـ لە بەر پێویستی زۆریان پێی ـ .

هەر چەند پێش ئەوەی بەسەریانا ببارێت رەشبین و بێ هیوا بوون ، جا تۆیش سەرنجی شوێنەواری رەحمەتی خوا بدە ، لەدڵی ئەو خەڵکە بێ هیوا بووەدا ، لەوسەرزەویەدا کە مردووبووە و

زیندووکراوەتەوە ، لەو ژیانەی کە سەر دەکێشێ بۆ ناو دلی خەلکەکە و بۆ ناو دلی زەوی . سەرنج بدە چۆن خوا ئەوزەویە زیندوو دەکاتەوە پاش ئەوە کە مردوو بوو ، ئەو خوایەی کە توانای زیندووکردنەوەی زەوی هەیە توانای زیندوو کردنەوەی لەشی مردووەکانیشی هەیە ، چونکە ئەو توانای بە سەرهەموو شتێکاهەیە جگە لەمانەش ئایەتی تر لەو بارەوە زۆرە لە سوورەتەکانی:( *الرعد القصص ،الانبیاء ،النمل ، ق* ) ، وە سوورەتەکانی تریش .

***کورتەیەکی صیفەتەکانی خوا لە قورئاندا :***

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هێما(إشارة )یان بۆ هەندێ لەو صیفەتانە کردووە کە بۆ خوای تەعالا پێویستن و دەشێ بۆ کەمالی خوایەتی خوابن ، ئەوەش هەندێك لەو ئایەتە پیرۆزانە:

***١ـ بوونی خوای تەعالا :***

خوای تەعالا دەفەرموێ:« *الله الذي رفع السموات بغير عمد ترونها ، ثم استوى على العرش ، وسخر الشمس والقمر كل يجري لأجل مسمى ، يدبر الأمر يفصل الأيات لعلكم بلقاء ربكم توقنون ، وهو الذي مد الأرض وجعل فيها رواسي وأنهارا ، ومن كل الثمرات جعل فيها زوجين اثنين ، يغشي الليل النهار ، إن في ذلك لأيات لقوم يتفكرون ، وفي الأرض قطع متجاورات وجنات من أعناب وزرع ونخيل صنوان*

***وغير صنوان يسقى بماء واحد ونفضل بعضها على بعض في الاكل إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون*** «الرعد/٢-٤»

واته : نموونه‌یه‌ك له ده‌سه‌لاتی خوا ئه‌وه‌یه،که : ئه‌و ئاسمانانه‌ی ده‌یانبینن خوا بێ‌کۆڵه‌که به‌رزی کردوونه‌ته‌وه وراگیری کردوون، ئینجا له‌سه‌رعه‌رش دانیشت‌و رۆژو مانگی رامکرد، هه‌ریه‌که‌ی له‌سه‌ر خولگه‌ی خۆی ده‌خولێته‌وه تا ئه‌و کاته‌ی بۆیان دیاری‌کراوه . ته‌گبیر و ته‌قدیری هه‌موو کارێك ده‌کات ، رێکیان ده‌کات و یه‌کیان ده‌خات . - ئه‌وه‌ی توانای به‌رزکردنه‌وه‌ی ئاسمانانی به‌بێ کۆڵه‌که هه‌بێ ، وه بوونه‌وه‌ریش به‌نه‌زم و ته‌رتیب به‌ڕێوه ببات توانای زیندووکردنه‌وه‌ی ئێوه‌یشی هه‌یه - تا لێتان یه‌قین بێ که ده‌گه‌ڕێنرێنه‌وه بۆلای خواو پاداشتی چاك و خراپی کرده‌وه‌تان وه‌رده‌گرن ..

خوای ئێوه ئه‌و خودایه زه‌وی درێژه‌دارکردووه و رایخستووه ، وه‌چه‌نده‌ها کێو و چیار رووبارو له هه‌موو جۆره میوه و به‌رو بوومێکی جووتی تیا دروستکردووه ، به تاریکی شه‌و رۆژ داده پۆشێ - و به رووناکی رۆژ تاریکی شه‌و راو ده‌نێ - ئاله‌و باسکراوانه‌دا به‌ڕاستی به‌لگه ونیشانه‌ی فراوان له‌سه‌ر بوون وده‌سه‌لاتی خوا هه‌یه‌بۆئه‌وانه‌ی بیبیربکه‌نه‌وه و مێشکی خۆیان به‌نبج نه‌که‌ن ..

له‌سه‌ر زه‌ویدا چه‌نده‌ها پارچه زه‌وی هاوسێ و نزیك له‌یه‌کتر

هەیە ، یەکێکیان بە پیت و ئەویان بێ پیت ، یەکێکیان رەقەن و چەودار ئەوی تریان نەرم و لەبار ، یەکێکیان دڕکاوی و بێفەڕ ئەوی تر پاك و بەرهەمهێنەر ، ئەمانە لەزەویدا هاوسێ و نزیکی یەکترن ..وە چە ندەها باخی ترێ و دانەویلە و خورمای شەنگۆڵ و نا شەنگۆلی تێدایە ، ئەمانە هەموو لە یەك‌سەرچاوە ئاو دەدرێن ، بەلاّم بەرو بومیان لێك جیاوازە و رێزی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریانا دەدەین لە -روالەت و تام و بۆن و - خواردنا، بێگومان ئا لەوانەدا چەندەها ئایەت هەیە بۆ ئەوانەی عەقلیان بەکاربێنن ..

وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: « ***وهو الذي أنشأ لكم السمع والأبصار والأفئدة قليلا ما تشكرون ، وهو الذي ذرأكم في الأرض وإليه تحشرون ، وهو الذي يحيي ويميت ، وله اختلاف الليل والنهار أفلا تعقلون !*** » المؤمنون/ ٨٠.

واتە : خوا ئەو خوایە گوێ و چاو ودلی بۆ دروستکردوون تا پێی ببیستن و ببینن و بیبر بکەنەوە ،کەچی کەم وادەبێ سوپاسی ئەو نیعمەتانەی بکەن ،ئەو خوایەی کە ئەو تواناو وزە پێویستەی پێ بەخشیون ، هەر ئەو خودایە بلاّوەی پێ کردوون لەسەر زەویدا و کردونیتە جێنشینی خۆی و بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە ، تاپاداشتی چاکەو خراپەتان بداتەوە ، خوای ئێوە ئەوخودایە گیان بە بەری بێ‌گیاندا دەکات و ژیانی پێدەبەخشێت ، وەگیانیش لە گیاندار

دەستێنێ و دەمرێنێ ، وە گۆڕانی شەو و ڕۆژ بەدەست خودایە ، ئایا بیر ناکەنەوە و عەقڵتان بەکار ناهێنن ، کە ئەمانە بەڵگەن لەسەر بوونی بەدیهێنەرێکی بەدەسەڵات !؟

ئەم هەموو نیشانانە باسی( بوونی) خوایەکی بەتواناو زاناو بەدەسەڵات بۆ دەکات . وە بەڵگە لەسەر بوونی خوا ئەو دەسەڵات و توانایەیەتی لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم بوونەوەرە عەجیبو سەر سوڕهێنەرەدا ..

**٢ ـ *دێرینی خوای تەعالا و مانەوەی هەمیشەیی :***

خوای تەعالا دەفەرموێ :«***هو الأول والآخر ، والظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم***»الحديد/٣. واتە ئەو لە پێش هەموو شتێکدا بووە بەبێ سەرەتا ، وەدوای هەموو شتێکیش دەبێت بەبێ کۆتایی ، بەدەلیل و بەڵگە ئاشکرایەو لە هەست پەنهانەو بەهەموو شتێکیش دەزانێو ئاگای لێیەتی ..

وە هەر وەها دەفەرموێ :«***ولا تدع مع الله الها آخر ، لاإله الا هو ، كل شيء هالك الا وجهه له الحكم واليه ترجعون***» القصص/٨٨.

واتە :عیبادەتی چەند خوایەکی تر مەکە لە گەڵ (الله) دا ، چونکە هیچ خوایەکی تر نییە جگەلە(الله). هەموو شتێك تیادەچێت جگە لە زاتی ئەو . فەرمان هەر فەرمانی ئەوەو

بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە ..

وە هەروەها دەفەرموێ: «**كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذوالجلال والإكرام**» الرحمن /٢٧. واتە : هەرچی وا لە سەر زەویدا تیا دەچێت ، تە نها زاتی پەروەردگارت دەمێنێتە وە ، كە خاوەنی گەورەیی و مەزنی و رێزە .

ئەم ئایەتە پیرۆزانە هێمان بۆ صیفەتی دێرینی و هەمیشەییخوای تەبارەك وە تەعالا .

***

### ٣- *خوا لە هیچ دروستكراوێكی ناچێت :*

خوا دەفەرموێ:« **قل : هو الله أحد ، الله الصمد ، لم يلد ولم يولد ، ولم يكن له كفوا أحد .**» واتە : خوای من تاك و تەنیایە و ناوی (الله)یە،خوای من پێویستی بە هیچ شتێك نییە و هەموو شتێك پێویستی بەو هەیە ، خوای من كەسی لێنابێت و لەكەسیش نەبوە،وە هیچ وێنە و هاوتایەكی نییە ..

وە هەروەها دەفەرموێ: « **فاطر السموات والأرض ، جعل لكم من أنفسكم أزواجا ، ومن الأنعام أزواجا ، يذرؤكم فيه ، ليس كمثله شئ ، وهو السميع البصير.**»الشورى/١١. واتە : خوای من بەدیهێنەرو خولقێنەری ئاسمانان و زەوییە ، لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ دروستكردوون ، وە لە ئاژەڵیشا هاوجووتی

دروستکردووه، به هۆی هاوسەری و نێری و مێ بیەوە زۆرتان دەکات و بڵاوەتان پێدەکات لەسەر زەویدا تا زەوی ئاوەدان بکەنەوە، هیچ شتێك لە وێنەی خوا نییە وئەویش بیسەرو بینایە..

* * *

## ٤- خوا پێویستی بەهیچ شتێك نییە :

خوای تەعالا دەفەرموێ: ***«یاأیها الناس، أنتم الفقراء الى الله، والله هوالغني الحمید»*** فاطر/١٥. واتە : خەلکینە ، ئێوە هەژارن و پێویستتان بەخوا هەیە، خوا دەوڵەمەندو بێ ئیحتیاجە و لەلایەن فریشتەکانەوە سوپاس بۆکراوە، ئەگەر ئادەمیزادیش سوپاسگوزارنەبێ..

وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: ***«ماأشهدتهم خلق السموات والأرض ولا خلق أنفسهم، وماکنت متخذ المضلین عضدا»*** الکهف/٥١. واتە : نە لەدروستکردنی ئاسمانان و زەویدا ئەوانم بەشاهێد گرتووە و نە لەدروستکردنی خۆیشیاندا ، وە من سەرگەردانکەر ناکەمە کۆمەك و یارمەتیدەر لە دروستکردنی ئاسمانان و زەویدا .

ئەوەش هێمایە بۆ ئەوە کە خوا ی تەعالا خۆی کاری بوونەوەر بەڕێوە دەبات و پێویستی بە مەخلوقاتی نییە ، بەڵکو ئەوان پێویستییان بەو هەیە ..

### ٥ - تاك و تەنیایی خوا :

خوای تەعالا دەفەرموێ: « وقال الله: لا تتخذوا إلهين اثنين إنما هو إله واحد فإياي فارهبون ، وله مافي السموات والأرض وله الدين واصبا أفغير الله تتقون؟ ومابكم من نعمة فمن الله ثم إذا مسكم الضر فإليه تجأرون » النحل /٥١-٥٢.

واتە : خوا فەرموویەتی : دوو خوا بەجووت مەکەنە خوای خۆتان ، چونکە خوا خوایەکی تەنیایە و تەنیا لەمنیش بترسن ، هەرچی وا لەئاسمانان و زەویدا مولکی خوایە و بۆ ئەوە ، دینیش هەمیشە بۆ ئەوە ، ئایا جگە لە خوا دەترسێن؟ هەر نیعمەتێکتان هەیە هەمووی لەلای خواوە پێتان دراوە ، هەرکات زەرەرو زیانێکیشتان تووش ببێ هەر هاواری ئەو دەکەن و هانا و پەنا بۆ ئەو دەبەن.

وە هەروەها فەرموویەتی : « ولقد كفر الذين قالوا إن الله ثالث ثلاثة ، ومامن إله إلا إله واحد وإن لم ينتهوا عما يقولون ليمسن الذين كفروا منهم عذاب أليم ، أفلا يتوبون إلى الله ويستغفرونه ؟ والله غفور رحيم » المائدة/ ٧٣،٧٤. واتە: بێگومان ئەوانەی دەڵێن : خوا سیانن و (الله ) یەکێکیانە، بێگومان کافرن ، جگە لەیەك تاکە خوا هیچ خوایەکی تر نییە ، ئەگەر واز نەهێنن لەوەی دەیلێن کافرەکانیان سزایەکی بەسوێ دەدرێن . ئەوە بۆ

ناگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێخۆشبوون ناکەن ؟ خودا یش بەخشندە و لێبوردەو میهرە بانە ..

وە هەروەها فەرموویەتی : «أم اتخذوا آلهة من الأرض هم ينشرون ، لو كان فيهما آلهة إلا الله لفسدتا ، فسبحان الله رب العرش عما يصفون ، لا يسأل عما يفعل وهم يسألون ، أم اتخذوا من دونه آلهة ، قل هاتوا برهانكم ، هذا ذكر من معي وذكر من قبلي ، بل أكثرهم لا يعلمون الحق فهم معرضون ، وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لا إله إلا أنا فا عبدون» الأنبياء /٢١-٢٥.

واتە : یا چەند خوایەك لەسەر زەویدا دەکەنە خوای خۆیان و بڕوایان وایە مردو زیندوو بکەنەوە ؟ ئەگەر چەند خوایەك - جگە لە الله - لە ئاسمانان و زەویدا هەبوایە تێك دەچوون و وێران دەبوون ، ئەوەش لە ناویاندایە لەناو دەچوو ، پاك و بێ‌عەیبی بۆ ئەو خوایەی خاوەنی عەرشە ، دوورە لە هەموو ناتەواوییەك کە بۆ خوای دروست دەکەن ، کەس دەسەلاتی بەسەر خوادا نییە ، لەبەرئەوە هەرکارێکی بکات پرسیاری لێ ناکرێت ، بەلاّم خوا دەسەلاّتی بەسەر هەموو مەخلوقاتیدا هەیە ، لەبەر ئەوە پرسیاریان لێ دەکات و دەکرێنە بەرپرسیار..

ئایا پاش ئەم روونکردنەوەیە ئەوان هەر لەسەر ئەو بیرەن کە

خوا هاو بەشی بێ و چەند خوایەك بۆ خۆیان بڕیار دەدەن ؟! پێیان بڵێ : دەلیل و بەڵگە بۆ ئەم دەعوایەتان بێنن، ئەمە -قورئان - ئەو کتێبەیە کە لەلایەن خواوە بۆخۆم و ئوممەتەکەم هاتووە ، وە ئەوەش ئەو کتێبانەی تر کە بۆ پێغەمبەرانی پێشین و ئوممەتەکانیان هاتوون، تەماشایکەن بزانن جگە لە خوا بەیەکناسین شتی‌تری تیادەبینن ؟ -نەخێر، ئەوان بیر ناکەنەوە - بەڵکو بەشی زۆریان حەق لە ناحەق جیاناکەنەوە و بەڵگەو دەلیل کاریان تێ‌ناکات، لەبەرئەوە روو لەحەق وەردەگێڕن . وە لەپێش‌تۆدا هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ وەحیمان بۆکردووە،کە: جگە لە خۆم هیچ خوا یەکی تر نییە ، کەوابوو خۆم بپەرستن . »

وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ :«قل: لمن الأرض ومن فيها إن كنتم تعلمون ؟ سيقولون: لله ، قل : أفلا تذكرون ؟، قل: من رب السموات السبع ورب العرش العظيم ؟ سيقولون لله ، قل: أفلا تتقون ؟ قل: من بيده ملكوت كل شئ وهو يجير ولايجار عليه إن كنتم تعلمون ؟ سيقولون: لله ، قل : فأنى تسحرون ؟ بل أتيناهم بالحق وإنهم لكاذبون ، ما اتخذالله من ولد وماكان معه من إله ، إذا لذهب كل إله بما خلق ولعلا بعضهم على بعض ، سبحان الله عما يصفون ، عالم الغيب والشهادة فتعالى عما يشركون »المؤمنون /٨٤-٩٢.

واتە : بلێ: ئەگەر ئێوە دەزانن ،مولکی زەوی و ئەوەی لە زەویدا یە بۆ کێیە؟ دەڵێن : بۆ خوا یە ، بلێ:کە وابوو بۆ بیر ناکەنەوە ؟ بلێ: کێ بەدیهێنەرو خاوەنی حەوت ئاسمانان و خاوەنی عەرشی مەزنە ؟ دەڵێن: مولکی خودان . بلێ: کەوابوو بۆ لەسزای خوا ناترسن ؟؟ بلێ: کێ خاوەنی هەموو شتێکە لەم بوونەوەرەدا؟ ئەگەر ئێوە پێ‌بزانن خوا پەنای هەرکەس بدات پارێزراوە ، بەلاّم هیچ کەسێك لە تۆڵەو سزای خوایی پەنا نادرێت، دەڵێن: هەمووی بە دەست خودا یە و کەسێکی تر توانای ئەوەی نییە، بلێ: ئیتر بۆچ خۆتان دەخلەتێنن و خۆتان چەواشە دەکەن ؟ ئێمە بەحەق و دینی حەقەوە هاتووین بۆلایان و ئەوان درۆزنن کە بوختان بۆ خوا دەکەن . خوا بڕیاری کوڕی بۆخۆی نەداوە و کەسی نەکردۆتە کوڕی خۆی و **هیچ خوایەکیشی لەتەکا نییە** ، ئەگەر خوای تری لەگەڵدا بوایە ، هەر خوایەی بەجۆرێ شتی دروست دەکردو بوونەوەر بێ‌ئەزم و تەرتیب دەبوو ، هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا زاڵ دەبوون . خوا پاك و بەرییە لەو درۆو بوختانانە ، خوا ئاگاداری نهێنی و ئاشکرایە،خوا زۆر لەوە بلندترە شەریك و هاوەڵی بۆ دابنێن »..

وە هەروەها خوا دەفەرموێ :« *قل : الحمد لله ، وسلام على عباده الذين اصطفى ، آلله خير أما يشركون ؟ أمن خلق*

السموات والأرض، وأنزل لكم من السماء ماء فأنبتنا به حدائق ذات بهجة ماكان لكم أن تنبتوا شجرها، أإله مع الله ؟ بل هم قوم يعدلون ، أمن جعل الأرض قرارا ، وجعل خلالها أنهارا ، وجعل لها رواسي ، وجعل بين البحرين حاجزا ، أإله مع الله ؟ بل أكثرهم لا يعلمون ،أمن يجيب المضطر إذا دعاه، ويكشف السوء ، ويجعلكم خلفاء الأرض ؟ أإله مع الله ؟ قليلاما تذكرون ، أمن يهديكم في ظلمات البر والبحر ؟ ومن يرسل الرياح بشرا بين يدي رحمته ؟ أإله مع الله ؟ تعالى الله عما يشركون ، أمن يبدأ الخلق ثم يعيده ؟ ومن يرزقكم من السماء والأرض ؟ أإله مع الله ؟ قل : هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين » النمل / ٥٩-٦٤.

واته : بلّێ : سوپاس بۆ خوا و سلاو له به نده هه‌لبژێرراوه‌كانى بێت ، ئايا پەرستنى تەنيا خوا چاكتره ، يا ئەو بتانەى دەيانكەنە شەريكى خوا ؟ ئايا ئەوەى ئاسمانان وزەوى دروستكردووه و ئاوتان لەئاسمانەوه بۆ دەبارێنێ و باخ ز بێستانى جوانتان بۆ پێ سەوز دەكات و سەوز كردنيشيان لەتواناى‌خۆتاندا نييه ، ئايا لەبياتى سوپاسگوزارى ، چەند خوايەك لەگەڵ خوادا دەپەرستن ؟ بەڵكو ئەوانه قەومێكن لەحەق لادەدەن و شەريك بۆخوا دا دەنێن ..

· ئايا پەرستنى ئەو بتانه چاكتره يا پەرستنى ئەو خوايەى كه

زەوی بۆ کردونەتە مەلبەند و لانکە و چەندەها رووباری تیا دروستکردووە و چیاکانی بۆ داناوە تازەوی پیّ دامەزرێنیّ و لەنێوان دوودەریادا پەردەیەکی درستکردووە تاسوێر و شیرین ناوێتە نەبن ؟ ئایا لە دروستکردن و بەدیهێنانی بوونەوەردا چەند خوایەك هەیە ؟! ـ نەخێر ـ بەلکو بەشی زۆریان قەدری مەزنی و گەورەیی خوا نازانن ..ئایا ئەوەی دێت بەهاواری لێقەوماوەوە کاتیّ هاواری بۆدەبات و ناخۆشی وناڕەحەتییەکەی لەسەر لادەبات و دەرووی لێدەکاتەوە ودەتانکاتە جێنشین لەسەر زەویدا ، ئایا عیبادەتی ئەوخوایە چاکترە یا ئەو بتانەی کە هیچیان لە دەست نایەو لە گەڵ خوادا دەیان پەرستن ؟! زۆرکەم بیبیری نیعمەتەکانی خوا دەکەنەوە ..

ئایا ئەو بتانەی دەیانکەنە هاوبەشی خوا چاکترن ، یا ئەو خوا تاك و تەنیایەی لە تاریکییەکانی زەوی و دەریادا رێنموونیتان دەکات و بالە پێش بارانەوە دەنێریّ تا مژدەی بارانتان بداتیّ و خاکی مردووتان بۆ زیندوو بکاتەوە؟! ئایاچەند بتێك دەکەنە هاوبەشی خوا لەپەرستندا ؟ خوا زۆر لەوە بلندترە کەئێوە هاوبەش و شەریکی بۆ دادەنێن..

ئایا ئەوانەی دەیانکەنە شەریك و دەیانپەرستن چاترن ، یا ئەو خوایەی کە لەسەرەتاوە مەخلوقاتی دروستکردووە و دەشیان

گێڕێتەوە و ئەوەی رزقتان لە ئاسمان و زەوییەوە بۆ دەنێری ؟؟ کامیان چاکترن بۆ پەرستن ؟ ئایا چەند خوایەك شیاوی پەرستنن لەگەڵ (الله)دا ؟ بلێ : ئەگەر ئێوە راستن دەلیل و بەڵگەتان بێنن».

چەندەها ئایەتی تریش جگە لەمانە هەن ، کە هەموویان یەکبوونی خوا دەسەلمێنن ، لە چەندەها ئایەتی تریشدا جگە لەمانە هەن ، کە هەموویان یەکبوونی خوا دەسەلمینن ، لە : خودی خۆیا، لە صیفاتیا ، لە کردار و هەڵس و کەوتیا ، جگە لەخۆی خاوەن وپەروەردگارێکی دی نییە و لە خۆی بەولاوە خوایەکی تر نییە ..

***

## ٦- توانا وقدرەی خوای تەعالا :

خوای تەعالا دەفەرموێ :«*یاأیها الناس إن کنتم في ریب من البعث فإنا خلقناکم من تراب ، ثم من نطفة ، ثم من علقة ، ثم من مضغة مخلقة وغیر مخلقة ، لنبین لکم ، ونقر في الأرحام مانشاء إلی أجل مسمی ، ثم نخرجکم طفلا ، ثم لتبلغوا أشدکم ، ومنکم من یتوفی ، ومنکم من یرد إلی أرذل العمر لکیلا یعلم من بعد علم شیئا ، وتری الأرض هامدة ، فإذا أنزلنا علیها الماء اهتزت وربت وأنبتت من کل زوج بهیج ، ذلك بأن الله هو الحق ، وأنه یحي الموتی*

وأنه على كل شئ قدير ، وأن الساعة آتية لا ريب فيها ، وأن الله يبعث من في القبور » الحج/ ٥-٧.

واتە: خەلکینە ، ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووکردنەوەدا هەیە -دەزانن - ئێوەمان لەخاك دروستکردووە ئینجا لە نوتفە ،دوای ئەوەش لە پارچە خوێنێك دوای ئەوەش لە پارچە گۆشتێکی بێ شکلّ و بێ وێنە ، پاش ئەوە پارچە گۆشتێکی رەنگ و وێنە دار ، تا دەسەلاّتی خۆمتان بۆ روون بکەمەوە ، ئەوەی خوا بییەوێ پێ‌بکات و بێنێتەوە ، لە مندالدانا دەیهێلێتەوە تا کاتی لە دایك بوونی و ئەوسا بەشێوەی مندالی ساوا لە مندالدانا دەیکەینە دەرەوە ، دوای ئەوە تەمەنتان دەدەینێ تا دەگەنە هەرەتی جوانی وکەمالی عەقلّ، هی واتان هەیە لەوتەمەنەدا دەمرێت‌و هی وایشتان هەیە تادەگاتە پیری دەمێنێتەوە ..

ئەو زەویە وشك و بێ گیایە دەبینیت ، کاتێ ئاومان بەسەرا باراند ، دەبزوێت و گەشە دەکات و لە هەموو جۆرێك سەوز دەکات و دیمەنی جوان دەبێت ، - باسکردنی ئەو دروست کردنەی مرۆڤ لە خاك و ئینجا نوتفە و قۆناغەکانی کۆرپەلە لە منالداندا و دوایش لە قۆناغی مندالی و جوانی و لاوی و پیری وقۆناغەکانی تری ژیاندا ، وە سەوزکردنی زەوی و رووەك بەهۆی بارانەوە ، - بۆ ئەوەبوو تا حالی بین کە ئەوە دەسەلاّت و توانای

خودایه ، خودایش حەققە و گومانی تێدانییە و ئەو بتانەی ئێوە دەیان پەرستن هیچ و پووچ و بە تاڵن ، چونکە توانای هیچیان نییە ، وە هەروەها تا حاڵی بێن ئەو خودایەی توانای دروستکردنی ئەوانەی هەبێ توانای مردوو زیندوو کردنەوەیشی هەیە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە و بێگومان بن رۆژی قیامەت دێت و شکی تێدانییە و ئەوانەی لە ناو گۆڕدان خوا زیندوویان دەکاتەوە ..

وە هەروەها دەفەرموێ :« *ما أشهدتهم خلق السموات والأرض ولا خلق أنفسهم وما كنت متخذ المضلين عضدا* » الكهف /٥١. واتە : لە دروستکردنی ئاسمانان و زەوی و دروستکردنی خۆیاندا ئەم کردوونەتە شاهێد و من هیچ کەس ناکەمە کۆمەکی خۆم - ئەگەر لە فەرزی مەحالیشدا شتی وابێ - ئەوانەی گومڕاکەرن نایانکەمە قۆڵی خۆم وکۆمەکیان لێوەرناگرم . واتە: خوا خۆی ئەو پەڕی توانایی هەیە و پێویستی بەکەس نییە ..

وە هەروەها دەفەرموێ:« *ولقد خلقنا السموات والأرض وما بينهما في ستة أيام وما مسنا من لغوب* »ق/٣٨.واتە: بە ڕاستی ئێمە ئاسمانان و زەوی و نێوانیانمان لە ماوەی شەش رۆژدا دروستکردووە و هیچ شەکەتی و ماندوو بوونێکمان تووش نەبووە ..

وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ :« وهوالذي مرج البحرين هذا عذب فرات وهذا ملح أجاج : وجعل بينهما برزخا وحجرا محجورا ، وهو الذي خلق من الماء بشرا فجعله نسبا وصهرا ، وكان ربك قديرا »الفرقان /٥٤.واتە:خوای ئێوە ئەو خودایە دوودەریای بە تە نیشت یەکەوە دروستکردووە : یەکێکیان شیرین و خۆش نۆش ، ئەوی تریان سوێر و زەحمەت نۆش، پەردەیەکی لەنێوانیانا دروستکردووە پێکەوە دەڕۆن و تێکەڵ بەیەکتر نابن ، خوای ئێوە ئەو خودایە کە مرۆڤی لەئاو دروستکردووە و نێرو مێی لێ پێکهێناوە ، پەروەردگاری تۆ بەدەسەڵات و توانایە ..

وەهەروەها خوا دەفەرموێ:«ألم تر أن الله يزجي سحابا ثم يؤلف بينه ثم يجعله ركاما فترى الودق يخرج من خلاله وينزل من السماء من جبال فيها من برد فيصيب به من يشاء ويصرفه عن من يشاء ، يكاد سنا برقه يذهب بالأبصار ، يقلب الله الليل والنهار إن في ذلك لعبرة لأولي الأبصار ، والله خلق كل دابة من ماء فمنهم من يمشي على بطنه ومنهم من يمشي على رجلين ، ومنهم من يمشي على أربع ، يخلق الله ما يشاء ،إن الله على كل شئ قدير » النور / ٤٣-٤٥.

واتە: ئەوە نابینیت خوا هەورەکان دێنێت و ئینجا کۆیان

دەکاتەوە و یەکیان دەخات، ئینجا یەك لەسەر یەك گردیان دە کاتەوە و چڕو پڕیان دەکات و بارانی لێدەبارێنێ ، وە ئە و هەورانەش کە لەشێوەی کێودان تە رزەیان لێدەبارێنێ بەسەر ئەوانەی خۆی بییەوێ و دووریشی دەخاتەوە لەوانەی خۆی نەیەوێ، بریقەی بروسکەی ئەو هەورانە نزیکە ئاوی چاو ببات ، خوا شەو و رۆژ دەگۆڕێ بە زیاد و کەم ، یان بە سارد و گەرم ، یان بەدرێژ و کورت، بێگومان لە وەشدا پەندو عیبرەت هەیە بۆ ئەوانەی بینایی و وردبوونەوەیان هەبێ و خاوەن هۆش بن ..

خوا لەناو هەموو زیندەوەرێکی دروستکردووە ، هی وایان هەیە لە سەرسکی دەڕوات و خشۆکە ، هی وایان هەیە لەسەر دوو پێ دەڕوات ، هی وایشیان هەیە بە چوار پێ دەڕوات و ڕێدەکات ، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات ، بێگومان خوا **توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە** »..

ئەمەو چەندەها ئایەتی تریش کەهەموو بەلگەن لە سەرگەورەیی و مەزنی و دەسەلأت و توانایی خوای تە بارەك وە تەعالا ..

***

## ٧- ویست و إرادة ەی خوای تەعالا :

خوا دەفەرموێ: *«إنما أمره إذا أراد شيئا أن يقول له : كن ، فيكون»* یس/٨٢. واتە : کاری خوا وایە ویستی هەرشتێ

ببێت ، به وشەی (ببە) فەرمانی پێ دەکات ئەویش دەبێت و دێتە وجود ..

وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: «**وإذا أردنا أن نهلك قرية أمرنا مترفيها، ففسقوا فيها، فحق عليها القول ، فدمرناها تدميرا**» الاسراء/١٦. واتە: **کاتێ ویستمان** ئاوەدانییەك وێران بکەین ، فەرمان دەدەین بە خۆش گوزەرانەکانیان بۆ چاکەکردن ، ئەوانیش سەرپێچی دەکەن و خراپەی تیادەکەن ، وەعدەو بەڵێنی خوایان لە سەر دێتە دی و بەوێرانکردن وێرانی دەکەین .

وەهەروەها لەبەسەرهاتی مووسا -علیه السلام- دا بەدەم خدر-خضر- ەوە خوای تەعالا دەفەرموێ: «**فأراد ربك أن يبلغا أشدهما ويستخرجا كنزهما رحمة من ربك ، وما فعلته عن أمري ، ذلك تأويل مالم تسطع عليه صبرا**» الكهف/٨٢.

واتە : پەروەردگارت بە رەحمی **خۆی ویستی** گەنجینەکە بۆ ئەو دوو هەتیوە بمێنێتەوە، چونکە باوکیان پیاوێکی صالح بووە ، تائەم دیوارە تازەیە خراپ دەبێتەوە ئەوانیش پێ‌دەگەن و بەهێز دەبن ، ئەوکاتە گەنجینەکەیان دەردێنن ، من لەخۆمەوە ئەو کارانەم نەکرد ، ئەوەش روونکردنەوەیەك بوو لەبارەی ئەو کارانەوە کەتۆ نەت توانی لەبەرامبەریانەوە خۆ گربی..

وە هەروەها فەرموویەتی: «**یرید الله لیبین لکم ویهدیکم سنن الذین من قبلکم ویتوب علیکم والله علیم حکیم، والله یرید أن یتوب علیکم ویرید الذین یتبعون الشهوات أن تمیلوا میلاً عظیماً، یرید الله أن یخفف عنکم، وخلق الإنسان ضعیفا**» النساء /٢٦-٢٨.

واتە: خوا دەیەوێ بۆتان روونبکاتەوە کە بەرژەوەندی ئێوە لە چیدایە، وە بۆ رێگەو بەرنامەی پێغەمبەرانی پێش خۆیشتان رێنموونیتان بکات، خوا تۆبەتان لێوەربگرێ، خوا زاناو کاربەجێیە خوادەیەوێ - بەم شەریعەت و یاسا نوێیە - تۆبەتان لێوەربگرێ و دەروونتان پاك بکاتەوە. ئەوانەش کە شوێن هەواو هەوەس دەکەون دەیانەوێ بە جۆرێکی گەورەو بەربڵاو لە بەرنامەی خوا لابدەن. خوا دەیەوێ ئەرکی سەرشانتان کەم بکات، بۆیە نیکاحی بۆ حەڵاڵ کردوون ـ بە هەل و مەرجی تایبەتی خۆی زیاد لەژنێکیشی بۆ حەڵاڵ کردوون ـ چونکە دەزانێ ئادەمیزاد لاوازە و بەلاوازی دروستکراوە..

ئەمەو چەندەها ئایەتی تریش کەباسی ویست و ئیرادەی خوای تەعالا دەکەن، بەڵێ، **خوا خاوەنی ویستە** و ویستی ئەویش لە زوور هەموو ویستێکی ترەوەیە..

* * *

## ٨ ـ زانیاری «علم» خوا :

خوای تەعالا دەفەرموێ :«الحمدلله الذي له ما في السموات ومافي الأرض، وله الحمد في الآخرة ، وهو الحكيم الخبير ، يعلم مايلج في الأرض وما يخرج منها، ومابنزل من السماء ومايعرج فيها، وهو الرحيم الغفور»سبا/١و٢. واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەهەرچی لە ئاسمانان و زەویدا هەیە مولکی ئەوە، و لەدوارۆژدا سوپاس هەربۆئەوە ، وە ئەویش کاربەجێیە و ئاگادارە بە هەموو شتێك ، ئاگاداری و زانیارییەکی تەواوی هەیەو نموونەیەك لەو ئاگادارییەی خۆیمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێ :ـ دەزانێ چی بەزەویدا دەچێت و چیش لەزەوی دێتەدەر و چی لە ئاسمانەوە دێتەخوار و چیش بەرەو ئاسمان سەردەکەوێ ،لەگەڵ ئەم هەموو زانیاری و ئاگادارییەدا سر پۆش و بەرەحمە ، وە لێبوردە و گوناھ بەخشە .

وەهەروەها فەرموویەتی :«و يعلم مافي السموات والأرض ويعلم ماتسرون وماتعلنون والله عليم بذات الصدور »التغابن /٤. واتە: ئەوەی لەئاسمانان و زەویدایە خوا پێی دەزانێ ودەشزانێ چی بەنهێنی و ئاشکرا دەکەن ، -لە بەر ئەوە بادیوی ناوەو دەرەوەتان وەك یەك بێ چونکە - زانایەو دەزانێ چی لەناو دڵ و دەروونداپە »

وەهەروەها خوای تەعالا بەدەم لوقمانەوە کە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات دەفەرموێ: «یا بني ، إنها إن تك مثقال حبة من خردل فتكن في صخرة أو في السموات أو في الأرض يأتي بها الله إن الله لطيف خبير »لقمان /١٦. واتە: کوڕی خۆم ، ئەو کارەی تۆ ئەنجامی دەدەیت چ چاك و چ خراپ ئەگەر بەئەندازەی دەنکە خەردەلێکیش بێت لەشاراوەترین جێگادابێ وەك ناو دڵی بەردێك ، یا لەبەرزترین شوێنا بێت وەك ئاسمان ، یالە خوارووترین شوێنا بێت وەك ژێر زەوی ، لای خوا ون نابێ و لەرۆژی قیامەتا دەیخاتەوە پێشچاوت ، وەپاداشتەکەی وەردەگریت، ئەگەرخێر بوو بەخێر ، وەئەگەر شەڕیش بوو بەشەڕ ، بێگومان زانیاری خوا دەگاتە هەموو شاراوەیەك وە ئاگادارە بەهەموو کردەوەیەکی نهێنی وئاشکرای خەلکی ..

وەهەروەها لە بەسەرهاتی شوعەیب ـ علیه السلام ـ و قەومەکەیا خوای تەعالا دەفە رموێ :« قال الملأ الذين استكبروا من قومه لنخرجنك ياشعيب والذين آمنوا معك من قريتنا أو لتعودن في ملتنا ، قال : أو لو كنا كارهين ؟ قدافترينا على الله كذبا إن عدنا في ملتكم بعد إذ نجانا الله منها ، ومايكون لناأن نعود فيها ، إلا أن يشاء الله ربنا ، وسع ربنا كل شئ علما ، على الله توكلنا ، ربنا افتح بيننا وبين قومنا بالحق

*وأنت خير الفاتحين* ﴾الأعراف/٨٨-٨٩.

واتە: دەست و دایەرەی خۆ بەزلزانی میللەتەکە، بەناوی -پیاوماقولآن -هەرەشەیان لە شوعەیب وئیماندارا نکرد و گوتیان : ئەی شوعەیب ، یەکێ لەم دوورێگایە بۆ خۆتان هەلبژێرن : یاخۆت و ئیماندارانی شوێنکەوتووت لـە ئاوا یی دەردەکـەین ، یـا دەبـێ بگەڕێنەوە بۆ ناو دینەکـەی خۆمـان !! شـوعـەیب لە وەلآمیـاندا گوتی: تەنیا ئەم دوو رێیەمان بۆ دادەنێین ئەگەر هەردووکیشیانمان پێ ناخۆش بێت ؟ ئەگەر ئێمە جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ ناوئێوە کە خوا رزگاری کردووین و وازلە دینەکەمان بێنین ئەوە درۆمان بەدەم خواوە هەلبەستووە ، هەرگیز ناگەڕێینەوە بۆ بتپەرستییەکەی ئێوە ، مەگەر خوا بیبەوێ ، ئێمەش خوا پشتیوانمانە ، لەبەر ئەوە بەتەما نەبن خوا بیبەوێ بگەڕێینەوە بۆ ناو دینی ئێوە ، **خوای ئێمە زانیاری فراوانی بە هەمووشتێك هەیە** ، ئێمەش هەمووکارێکی خۆمان بەو سپاردووە و پشتمان بەو بەستووە ، ئەگەر واز لەزولمی خۆتان نەهێنن هانای بۆ دەبەین و دەلێین : ئەی خودایە ، لە نێوان ئێمەو قەومەکەماندا حوکمی بەحەقی خۆت دەربکە ـ چۆن فریای ئیماندارانی پێشین کەوتویت ئاوهایش فریای ئێمە بکەوە ـ تۆیش لە هەموو حاکمێك چاکتر و عادلتریت ..

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿*ألم تر أن الله يعلم مافي*

***السموات ومافي الأرض ؟ مايكون من نجوى ثلاثة إلا هو رابعهم ، ولاخمسة إلاهو سادسهم ، ولا أدنى من ذلك ولا أكثر إلا هو معهم أينما كانوا ، ثم ينبئهم بماعملوا يوم القيامة ، إن الله بكل شئ عليم*** » المجادلة /٧ .

واته : ئایا نازانیت ، چی لە ئاسمان و زەویدایە خوا پێیدەزانێ و عیلمی پێی هەیە؟ هەرکات سێ کەس بەیەکەوە چپە بکەن خوا چوارەمیانە ، پێنج کەس پێکەوە چپە بکەن خوا شەش هەمیانە ، لەوە کەمترو زۆرتر لە هەرکوێ بن خوا لەگەڵیانەو ئاگای لێیانە ، ئینجا لە رۆژی قیامەتا بە کردەوەکانی خۆیان ئاگادار دەکرێنەوە ، **بێگومان خوا بە ـ چپە ـ و هەموو شتێك ئاگادارە ..**

وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ : «***وماتكون في شأن وماتتلوا منه من قرآن ، ولا تعملون من عمل ، إلا كنا عليكم شهودا ، إذ تفيضون فيه ، وما يعزب عن ربك من مثقال ذرة في الأرض ولا في السماء ولاأصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتاب مبين*** » يونس /٦١.

واته : ئەی پێغەمبەر ، هەرکارێك بکەیت ، تایبەتی بێت یاگشتی ، وەهەر شتێ لە قورئان بخوێنیتەوە ، بۆ عیبادەتی تایبەتی خۆت بێ ، یا بۆ بانگکردن و گەیاندنی بێ ، هەر کارێك بکەن ئێمە چاو دێرین و ئاگامان لێتانە کە تیایا رۆدەچن ، هیچ شتێك لە عیلمی

پەروەردگارت شاراوە نییە ، یا ئەو شتەش بە ئەندازەی گەردیلەیەك بێت ، لە زەویدا بێت یا لە ئاسمان ، بچووك تر لە وەو گەورە تر لەوەش لە خوا ون نابێ و لە و کتێبەدا نووسراوە کە هەموو کارو بارێکی بوونەوەری تیا روونکراوەتەوە ..

ئەمەو چەندەها ئایەتی زۆری تریش کەهەموویان بەلگەن لە سەر زانیاری فراوانی خوای تەعالا ، و ئاگادار بوونی لە هەموو شتێك، ئەو شتەش کەم بێ یازۆر ، بچووك بێ یاگەورە ..

***

## ٩ ـ ژیان و حەیاتی خوای تەعالا :

خوای تەعالا دەفەرموێ : « *الله لا إله إلا هو الحي القيوم ، لا تأخذه سنة ولانوم له ما في السموات ومافي الأرض .* » البقرة / ٢٥٥.

واتە: جگە لە (الله) هیچ خودایەکی تر نییە و ئەویش زیندووە و سەرپەرشتی بوونەوەر دەکات و کارو باری بوونەوەر هەمووی بەدەست ئەوە ، نەوەنەوز دەدات و نەخەوی لێ دەکەوێت ، چی وا لە ئاسمانان و زەویدا هی ئەوەو بۆ ئەوە .

وەهەروەها فەرموویەتی : « *الله لاإله إلا هو الحي القيوم ، نزل عليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه ، وأنزل التوراة والإنجيل من قبل هدى للناس وأنزل الفرقان ، إن الذين كفروا*

***بآيات الله لهم عذاب شديد..»*** آل عمران /٢-٤.

واتە:جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نییە ، ئەویش زیندووە و سەرپەرشتی بوونەوەر دەکات و قورئانێکی بۆ ناردوویت کەپڕیەتی لەحەق . پشتگیری ئەوانەی پێش خۆی دەکات ، وە پێشتر تەوراتی بۆ مووسا و ئینجیلی بۆ عیسا رەوانەکردووە ، تارێنموونی بن بۆخەلکی،ـ چونکە ئەوان دەستیان تێبرابوو ـ ( فورقان) واتە: قورئانی نارده خوارەوە تاحەق لەباتڵ جیابکاتەوە ، بێگومان ئەوانەی باوەڕیان بەئایەتەکانی خوانییە سزایەکی سەختیان بۆ هەیە ..

وەهەروەها فەرموویەتی: ***«الله الذي جعل لكم الأرض قرارا ، والسماء بناء ، وصوركم فأحسن صوركم ، ورزقكم من الطيبات ، ذلكم الله ربكم ، فتبارك الله رب العالمين ، هو الحي لا إله إلا هو فادعوه مخلصين له الدين ، الحمد لله رب العالمين»*** غافر/٦٤و٦٥.

واتە: ئەو خوایەی زەوی کردۆتە لانکەو ئاسمانی بۆکردوونەتە سەقفێکی رازاوە و بەجوانترین شێوە وێنەی کێشاون و لەخواردن و خواردنەوە پوختەکان رزقی داون ، ئەو خوایە پەروەردگارو خاوەنی ئێوەیە ، رێزو گەورەیی بۆ (الله)یە کە پەروەردگاری هەموجیهانە ، ئەو زیندووە و جگە لە خۆی هیچ خوایەکی ترنییە ،داوا لەو بکەن و دینتان بە پاڵفتەیی بۆ ئەو بێ سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان ..

وە چەندەها ئایەتی زۆری‌تر کەهەموو بەلگەن لە سەر ئەوە کە خوای تەبارەك وەتەعالا ژیانی تەواوی هەیە و هیچ ژیانێك لە ژیانی ئەو کاملتر نییە..

***

**١٠ - بیستن و بینینی خوای تەعالا :**

خوای تەعالا دەفەرموێ: *﴿قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي الى الله ، والله يسمع تحاوركما ، إن الله سميع بصير﴾* المجادلة/١. واتە: **بێگومان خوا قسەی ئەو ئافرەتەی بیست** کەلەبارەی مێردەکەیەوە دەمە قسەی لەگەڵ تۆدا بوو ، وەسکاڵای بۆ لای خوا دەبرد ، خوا وتو وێژەکەتان دەبیستێ ، **بێگومان خوا بیسەرو بینایە .**

وە هەروەها دەفەرموێ: *﴿أرأيت الذي ينهى عبدا إذا صلى ، أرأيت إن كان على الهدى ، أو أمر بالتقوى ، أرأيت إن كذب وتولى ، ألم يعلم بأن الله يرى؟﴾* العلق/ ٩-١٤. واتە حاڵی ئەوەت بینی کەسەرکەشی و یاخی بوونی گەیشتبوە ئەندازەیەك جلەوگیری لە نوێژکردنی عەبدێك لەعەبدانی خوا دەکرد . پێتم بڵێ ئەگەر ئەو سەرکەشە یاخییە ڕەوشتی جوانی پیاو چاکانی هەبوایە و داوای چاکەو پارێزکاری بکردایە ، بۆ وی باشتر نەبوو لە بێ‌باوەڕی و جلەوگرتنی عیبادەتی خوا ؟!

پێم بڵێ ، هەوالم بدەێ ، ئەگەر ئەو کافرە بەلگەو دەلیلەکانی یەکخوا بوونی بەدرۆ زانی و بڕوای پێ نەکرد و پشتی کردە بانگەوازەکەی تۆ و گوێی بۆ ڕێنموونییەکانی تۆ نەگرت و خەلکیشی بۆئەو حالەی خۆی هان دەدا ، ئایا نازانێ خوا دەیبینێ و ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە و واز نەهێنێ دووچاری ڕۆژێکی ڕەشی دەکات و سزایەکی سەختی دەدات ؟؟.

وەهەروەها کاتێ خوا مووسا و هاروونی نارد بۆلای فیرعەون فەرمانی پێدان و فەرموی : «*إذهبا إلى فرعون إنه طغى ، فقولا له قولا لينا ، لعله يتذكر أو يخشى ، قالا: ربنا إننا نخاف أن يفرط علينا أو أن يطغى ، قال: لا تخافا إنني معكما أسمع وأرى*» طه / ٤٦.

واتە: بڕۆن بۆلای فیرعەون ئەو لە خوا یاخی بووە و لەسنووری خۆی تێپەڕیوە، بەقسەیەکی نەرم و لە سەرخۆ قسەی لە تەکابکەن ، بەو هیوایەی کارەکەتان بەرهەمدار بێ ، بەلکو بییریکاتەوە یا بترسێ ، ئەوانیش گوتیان : ئەی پەروەردگاری مە ، دەترسین دەستمان لێ بوەشێنێ و پێش ئەوەی قسەکان تەواو بکەین بمانکوژێ ، یا تەکەبورمان بەسەرا بکات و بەرامبەر جەنابت بێ ئەدەبی بکات ، خوا فەرمووی : لەفیرعەون مەترسن من لە تەکتانام ئەوەش لەنێوانتانا ڕوودات دەیبیستم و دەیبینم »

وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ : « يعلم خائنة الأعين وما تخفي الصدور ، والله يقضي بالحق والذين يدعون من دونه لا يقضون بشيء ، إن الله هو السميع البصير »غافر / ٢٠.
واتە:خوا ئاگای لە خیانەتی چاوە و پێی دەزانێ و ئە وە ش کەلەناو دڵ و دەروونندا شاراوەتەوە ـ واتە خوا بەتیلەی چاو و ختوورەی دڵ دەزانێ ـ خوا دادگەرەو حوکم بەحەق دەکات ،وەئەو بتانەی کەدەیانپەرستن فریان بەسەر هیچەوە نییە ، چونکە ئاگایان لەهیچ نییەو توانایشیان بەسەر هیچ شتێکا نییە ، بێگومان خوا خۆی بیسەرو بینایە .

وەچەندەها ئایەتی تریش ، کەهەموو بەڵگەن لەسەر بوونی ئەو دوو صیفەتەی بیستن و بینین بۆ خوای تەبارەك وە تەعالا ..

***

## ١١ ـ قسەی خوای تەعالا :

خوای تەعالا دەفەرموێ :«... وكلم الله موسى تكليما » النساء/١٦٤.واتە : خوا بەقسە کردن لەگەڵ مووسادا قسەی کرد ..

وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ :«أفتطمعون أن يؤمنوا لكم وقد كان فريق منهم يسمعون كلام الله ثم يحرفونه من بعد ماعقلوه وهم يعلمون »البقرة /٧٥.واتە : ئا[illegible]ماعتان هەیە ئەوانە ئیمانتان پێ بێنن ، لەبەر ئەوە کە بانگیان دەکەن ؟؟ ـ وەك

ئەوە بفەرموێ : هیواتان بەوە نەبێ بە بانگەوازەکەی ئێوە ئیمان بێنن ـ چونکە کۆمەڵێك لەوانە قسەی خوایان لەتەوراتا دەبیست و پاش ئەوەش کەلێی حالی بوون و زانییان قسەی خوایە دەستیان تێوەردا و گۆڕییان، ئەمکارەشیان بەنەزانین نەبووە ، چونکە دەیانزانی چی دەکەن .ـ جانەگەر کۆمەڵێك ئاوەهابن چ هیوایەکتان پێیان هەیە !..

وە چەندەها ئایەتی تریش لەو بارەوە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوە کە خوای تەعالا صیفەتی قسەکردن و ئاخاوتنی هەیە ..

صیفەتەکانی خوا دوایی نایەن :

صیفەتەکانی خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزا زۆرن و کەماڵی خوا کۆتایی نایەت و عەقلی ئادەمیزاد دەرکی ناوەرۆك و حەقیقەتیان ناکات.. خوا پاك و( مونەززەهە)، ناتوانین بەوجۆرە ستایشی بکەین کەخۆی ستایشی خۆی کردووە ..

***

## لە نێوان صیفەتەکانی خوا و خەڵکیدا :

بۆ صیفەتێكلە صیفەتەکانی خوا وشەیەك بەکار هێنراوە ، هەمان وشەیش بۆ صیفەتێك لەصیفەتەکانی مەخلوقـ ئادەمیزاد ـ بەکار هێنراوە ، ئەوەی لەسەر ئینسانی ئیماندار پێویستە ، ئەوەیە

کە: دەبێ هۆشیاری ئەوەبێت کە : مەبەست لەنێوان واتای ئەو دوو وشەیەدا بەتەواوی مەعنا جیاوازە..

بۆ نموونە تۆ دەڵێیت : خوا زانایە ، زانیاری بووەتە صیفەتی خوا. دیسان دەڵێیت : فلانە کەسیش زانایە ، لێرە دا زانیاری بووەتە صیفەت بۆ فلانە کەس و بۆخوایش ، ئایا لەو دوو رستەیەدا مەبەست لەوشەی زانیاری یەکێکە ؟؟ حاشا لەوە کەوابێ ..بەڵکو زانیاری خوای تەعالا لەوپەڕی کەماڵ و تەواویدایە و کۆتایی بۆ نییە .بەڵام زانیاری ئادەمیزاد لەبەرا مبەر زانیاری خواوە وەك تنۆکێ ئاو لە بەرامبەر ئۆقیانووسێکیشەوە نییە .. لە بەرامبەر زانیاری خوداوە هەر هیچ نییە ..

وەهەروەها صیفەتەکانی تریش وەك ژیان و زانیاری و بیستن و بینین و ئاخاوتن و تواناو ویست ( *الحیاةوالعلم والسمع والبصر والکلام والقدرة والإرادة* ).. لە بارەی کەماڵ و چۆنیەتییەوە – لەهەموو ئەمانەدا – واتای وشە بەتەواوی جیاوزە لەواتای هەمان وشە کەبۆ صیفەتی ئادەمیزاد بەکار دەهێنرێ ، چونکە خوای تەعالا لەهیچ یەکێ لەمەخلوقە کانی خۆی ناچێت ، ئاگات لەم قسەیە هەبێ چونکە زۆر وردە ..

تۆیش داوای ئەوەت لێ نەکراوە ناوەڕۆك و ماهیەتی صیفەتەکانی بزانیت ، تەنیا ئەوەندە شوێنەواریان لەم بوونەوەرەدا

بزانیت، وه پێویستی وداخوازی ئەو صیفەتانەش لەبارەی خۆتەوە بزانیت ئیتر بەسە. داواکارین: خوا لە هەلخلیسکان بمانپارێزێ و تەوفیقیشمان بدات..

***

## بەلگەی عەقلی بۆ سەلماندنی صیفەتەکانی خوا:

زانایانی عەقیدە بۆ سەلماندنی صیفەتەکانی خوای تەعالا بەلگەی عەقلی و قیاسەکانی ژیربێژی (المنطق) یان بەکارهێناوە. ئێمەش دەڵێین: کارێکی باشیان کردووە، چونکە عەقڵ بنچینەی ناسین و زانینە، وە هەم بۆ ئەوەش شوێنەواری گومان و قسەی بێ جێی خوانەناسان لە دلی هیچ کەسێکدا نەمێنێ..

بەلاّم کار لەوە روونترە، چونکە بوونی خوای تەبارەك وەتەعالا و سەلماندنی ئەو صیفەتانەی کەتەواوی کەمالیان بۆ خوا تێدایە، لە ریزی ئەو شتەئاشکراو روونانەدایە کەسەلماندنیان پێویستی بە دەلیل و بەلگەنییە..بۆ ئەو مەبەستە مرۆڤ «متکبر» و دلنەخۆشەکان نەبێ کەسی تر داوای دەلیل ناکات، ئەوانەش هەزارەها بەلگەیان بۆ بێنیتەوە سوودی لێ وەرناگرن..بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بۆ تەواکردنی سوودی باسەکە هەندێ بەلگەی عەقلی دێنینەوەو بەشێوەیەکی کورت باسیان دەکەین و دەڵێین:

### بەلگەی یەکەم:

گەورەیی ودامەزراوی خودی ئەم بوونەوەرە بەلگەیە لەسەر بوونی بەدیهێنەر و خالقەکەی،وە لەسەر کەمالّ و مەزنیەتیشی ..

### بەلگەی دووەم :

ئەوەی شتێکی نەبێ ناتوانێ بیبەخشێ ، - بۆ نموونە: ئەوەی زانیاری نەبێ ناتوانێ زانیاری ببەخشێ - ئەگەر بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە صیفەتی کەمالی نەبێ، چۆن شوێنەواری ئەو صیفەتانە لە مەخلوقەکانیا دەبینرێت ؟؟

### بەلگەی سێ هەم :

ئەمەش تایبەتە بەتاك و تەنیایی ئەو بەدیهێنەرە مەزنەوە، چونکە بوونی چەند خالق و بەدیهێنەرێك دەبێتە هۆی تێکچوون و ناکۆکی و خۆ بلندکردن ، نەخوا زەلاّ حالی خوایەتیش کەبریتییە لە گەورەیی و کیبریا ..

ئەگەر لەو چەند دانەیە تەنیا یەکێکیان دەست بەکار بوو ، صیفەتی ئەوانی تر دەوەستێ ، ئەگەر هەموویان هاوبەشیان کرد ، هەریەکەیان هەندێ لەصیفەتەکانیان دەوەستێ - چونکە- هیچیان نەیانتوانیوە بەتاقی تەنیا ئەو کارە بکەن و پێویستیان بەیارمەتی یەکتربووە ، پێویستی بوونیش بۆ صیفەتی توانایی خوا ناتەواوییە ، - کەوابوو - وەستان و بێکارەبوونی صیفەتەکانی خوایەتی لەگەلّ

مەزنی و گەورەیی خوادا ناگونجێ . کەوابوو پێویستە تەنیا خوایەك هەبێ و جگە لەو پەروەردگارێکی تر نەبێ ..

ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لەبەڵگەی ژیربێژی لەسەر بوونی خالق و سەلماندنی صیفەتەکانی . ئەوەش پێویستی بەبەڵگەی زیاترە باسەر لەکتێبە گەورەکان بدات ، دەبێ ئەوە بزانین باوەڕ بەبوونی خواو صیفەتەکانی لەسروشتی دەروونە خاوێنەکاندا جێگیر و مەحکەمە ، وە لە قووڵایی دڵەساغەکاندا هەیەو دامەزراوە .. و «ومن لم يجعل الله له نورا فما له من نور» النور/ ٤٠.ئەوەش خوا نوورو رۆشنایی نەداتێ رۆشنایی لەدڵیا نییە ..

***

**پرسیارێك :**

پرسیارێك دێتە پێش و خەڵکێکی زۆریش لە بەرامبەریەوە بێ وەڵام دەوەستن .. لە فەرموودەیەکدا ئەبوو هورەیرە - خوا لێی رازی بێ - دەگێڕێتەوە کە ، پێغەمبەر - صلى الله عليه وآله وسلم - فەرموویەتی : «**ولا يزال الناس يتساءلون حتى يقال هذا : خلق الله الخلق ، فمن خلق الله ؟ فمن وجد من ذلك شيئا فليقل آمنت بالله**»(١) رواه مسلم .

واتە : لە بیبر کردنەوەدا بەردەوام خەڵکی پرسیار دەکەن تا ئەم

(١) ئیمامی مازری - بە رەحمەت بێ - دەڵێ :رواڵەتی فەرموودەکە وادەگەیەنێ کە پێغەمبەر .

پرسیارە دەکرێت : خوا ئەم هەموو خەلکەی دروستکردووە ، ئەدی کێ خوای دروستکردووە؟ هەرکەس شتێ لەوبارەوە بە خەیالیا هات با بلێت : باوەڕم بە خوا هەیە ..

هەرچەند ئەم پرسیارە لەبنچینەوە هەڵەیە چونکە ئێمە فەرمانمان پێکراوە لەخودی خوا بیر نەکەینەوە هۆی ئەوەش ئەوەیە عەقلی کولی ئێمە تواناى دەرکی حەقیقەتی خودی خۆی نییە ، شتێکی ئاشکرایە کەلەبارەی دەرکی حەقیقەتی خودی خوایشەوە زۆرتر زەبوون و ناتوانایە ، بەلأم لەبەر ئەوەی دێت بە خەیالی هەندی کەسدا دەمانەوێ مەسەلەکەیان بۆ روون بکەینەوە و وەلأمیان بە نموونەیەك بدەینەوە تا-إن شاء الله - دەروونیان ئارام و ئاسوودەبێت ، بۆیە دەڵێین :

ئەگەر لە کتێبخانەکەتا کتێبێکت دانا و لە ژوورەکەی خۆت هاتیتە دەرەوە و پاش ماوەیەکی کەم چوویتەوە ژووریَ و دیتت

---

صلى الله علیه وآله وسلم - فەرمانی بە خەلکی کردووە ئەگەر شتێکی وا بە خەیالیانا هات بێ‌سەرلێدان و بەلگە هێنانەوە بۆ پووچکردنەوەی ئەو خەیالە پالی پێوە بنێن و پشتی تێبکەن ئینجا دەلێ : ئەو خەیالأنەی بە خەیالی ئادەمیزادا دێن دووجۆرن : جۆرێکیان چونکە بەهۆی شوبهە و گومانەوە نەهاتووە و لاوەکییە لە دەروونداجێگیر نابێ ، ئەمەیان پشتی تێدەکرێت و فەرمانی فەرمرودەکە بۆ ئەم جۆرەیانە ..

بەلأم ئەوانەی لە ئەنجامی گومانێکەوە دروست دەبن و لە دلا جێگیر دەبن و دەمێننەوە ، ئەوانە بەدەلیل هێنانەوە نەبێ لەناو ناچن ، دەبێ سەرنج و بیریان بۆ بخرێتە کار ، تا پووچ دەکرێنەوە .. والله أعلم .

ئەو کتێبەی دات نابوو لەسەر پلەکانە ، - ئالێرەدا - حەتمەن باوەڕت وادەبێ کەیەکێك لەسەر پلەکان دایناوە ، چونکە تۆ دەزانیت صیفەتی ئەو کتێبە وایە : خۆی خۆی بۆ ناگوێزرێتەوە..

ئەم خالە بخەرە زەینی خۆتەوەو لەبیرت نەچێ و وەرە لەتەکما بۆ خالێکی تر ..

ئەگەر لەژووری کتێبخانەکەتا کەسێك لەسەر کورسی دانیشتبوو، ئینجا هاتیتە دەرەوە و پاش ماوەیەك گەڕایتەوە ژوورێ و دیتت لەسەر مافوورەکان دانیشتووە ، تۆ لە هۆی جێ گواستنەوەکەی ناپرسیت و پێت وانییە یەکێکی تر لەو جێگەیەدا گواستبێتیەوە ، چونکە دەزانیت صیفەتی ئەو کەسە وایە : خۆی دەتوانێ خۆی بگوێزێتەوە و پێویستی بەوە نییە کەسێکی تر بیگوێزێتەوە ..

ئەم خالەیشت لەبیر نەچێت ، پاش گوێم بۆ بگرە بزانە چیت پێ دەلێم ..

لە کاتێکا مەخلوقات هەموویان لەنەبوونەوە پەیدابوون و ئێمەش لەسروشت و صیفەتیانەوە دەزانین کەخۆیان خۆیان بەدی نەهێناوە و پێویستیان بە بەدیهێنەرێك هەیە ، دەزانین ئەو بەدیهێنەرەش خوای تەبارەك وە تەعالایە ..

کەمالی خوایەتی کاتێ بەدی دێت کە پێویستی بە غەیری

خۆی نەبێ ، بەڵکو ئەوە یەکێکە لە سیفەتەکانی کە وەستانی خۆی بەخۆیەوە بێت و پێویستی بەشتێکی تر نەبێ ، ئەو کاتەش دەزانین هەبوونی خوای تەبارەك وەتەعالا بە هۆ ی خودی خۆیەتی و پێویستی بەوە نییە بەدیهێنەرێك بەدی بهێنێت ..

جا ئەگەر دوو خاڵەکەی پێشووت هێنا و لەپەنای ئەم خاڵی سێهەمەیانا دات نا ، ئەم مەسەلەیەت بۆ روون دەبێتەوە(١) و دەزانیت کە عەقلی ئادەمیزاد کولترە لەوەی لەم ئەندازەیە زیاتر رۆ بچێت .. داوا لەخوا دەکەین لە هەڵخلیسکان و پێ ترازان بمان پارێزێ بێگومان ئەویش زۆر میهرەبان و دڵۆڤانە ..

ئەوەش قسەی هەندێ لە زانایانی هەڵکەوتووی ئەورووپایی

---

(١) ئیمامی شەهید - بەرەحمەت بێ - وا دیارە مەبەستی ئەوە بێ : مادام ئێمە زانیمان لەجیهانی ماددی خۆماندا هەر شتێك سیفەتێکی تایبەتی خۆی هەیە ، بۆ نموونە: سیفەتی کتێب وایە : ناتوانێ گواستنەوەو جێگۆرکێ بەخۆی بکات ، وە سیفەتی ئادەمیزاد وایە : بێ ئەوەی کەسێکی تر بیگوێزێتەوە دەتوانێ لە جێگەیەکەوە بچێتە جێگەیەکی تر ، وە سیفەتی خوایش وایە کەدەبێ ئەبوونی بەسەرا نەهاتبێ و نابێ دروستکرابێ دەبێ هەر ببێ ..

هەریەك لەمانە سیفەتێکی تایبەتیان هەیە . ئەگەر کتێبێك لە شوێنێکەوە خۆی گواستەوە بۆ شوێنێکی تر ، دەزانیت ئەوە کتێب نییەو شتێکی ترە .. ئەگەر خوایش ئەبوونی بەسەرا هاتبێ و دروستکرابێ ئەوە خوا نییە و شتێکی ترە ..

وەرگێڕ .

لەبارەی سەلماندنی بوونی خوای تەعالاوەو دان نان بەکەمالی صیفەتەکانیا.. تەوفیقی من و تۆیش بەدەست خودایە ..

***

## قسەی زانا سروشتناسەکان :

لەوەپێش بۆمان باسکردیت کەئەم عەقیدەیە لە دەروونە ساغەکاندا شتێکی سرووشتی (فطری)یە ،لەدڵ و مێشکە خاوێنەکاندا جێگیر و دامەزراوە .. ئەم باسە لەوشتە روون و ئاشکرایانەیە کە بەڵگە نەویستن ، پشتاو پشت بەرھەمی ژیرییەکان پشتگیرییان دەکات . ئەوە شاھێدی زانایانی بوونەوەر (علماء الکون) لە ئەوروپاییەکان و غەیری ئەوانیش،ھەر چەند ئەم قسانەیان لە دینێك وەر نەگرتووە کە باوەڕیان پێی ھەبووە .. وا شایەتی ھەندێکیانتان بۆ باس دەکەم ، نەك بۆ پشتگیریکردنی عەقیدە بەقسەی ئەوان ، بەڵکو بۆ سەلماندنی ئەوە کە لەدەروونە ساغەکاندا عەقیدە جێگیر و دامەزراوە .. وە بۆ دەمکوتکردنی ئەوانەش کە بەناوی زانیاری و زانایانەوە خۆیان لە پەیوەندی عەقیدە دەپچڕێنن و رۆح و ویژدانی خۆیان بەشتی ھیچ و پووچ و بەتاڵەوە دەخلەتێنن ..

* * *

### ١- دیكارت زاناو فەیلەسوفی فەرەنسەیی :

دەڵێ:من لەگەڵ ئەوەدا كە هەست بەناتەواوی لەخۆما دەكەم، لەهەمان كاتا هەست بەوەدەكەم كە پێویستە زاتێكی كامڵ هەبێ . وە دەبینی ناچارم بۆ باوەڕ بوون بەوە : كە، ئەوزاتە كاملە خاوەنی هەموو صیفەتێكی كەمالەو ئەویش بریتییە لە (الله)و هەر ئەویش ئەو هەستەی لەخودی منا ناشتووە..

دیكارت لە قسەكەیا ناتەواوی‌و لاوازی خۆی و لەهەمان كاتا بوون‌و كەمالی خوایش دەسەلمێنێ. وە دان بەوەدا دەنێت كەلەلایەن خوداوە ئەوهەستەشی پێ‌بەخشراوەو كردوویەتە بەشێك لەسروشتی«فطرة الله‌التی فطرالناس علیها» فیطرەتی خوایی ئەو مەزاج و سروشتەیە كەخەلكی لەسەر ڕام هێناوەو لە قەوارەیاندا دروستی كردووە.

* * *

٢ـ ئیسحاق نیوتن : زانای بەناو بانگی ئینگلیزی‌و ئەوەی یاسای راكێشان «قانون‌الجاذبیة»ی دۆزییەوە، دەڵێ:گومانتان لە بەدیهێنەرو خالقدا نەبێت، چونكە ناچێتە عەقڵەوە تەنیا رێكەوتەكان پێشەواو رابەری ئەم بوونەوەرەبن ».

* * *

### ٣ـ هێرشەل زانای گەردوونناس:

ئەم زانا گەردوون ناسە ئینگلیزییە دەڵێ: «هەر چەند پشتێنەی زانیاری فراوانتر بێت، دەلیلو بەڵگەی بەهێزو پتەو لەسەر بوونی خالقێکی ئەزەلی کە هیچ سنوورو کۆتاییەك بۆ توانایی ودەسەڵاتی نییە، زۆرتر دەبێت.

زەوی ناسەکان «الجیولوجیون» وەبیرکاری زانەکان «الریاضیون» وەگەردوون ناسەکان «الفلکیون» وەسروشت ناسەکان «الطبیعیون» هاوکاری پتەویان لەدروستکردنی قەڵای زانیاریداکردووە، کە ئەویش قەڵای مەزنی خوای تاكو تەنیایە»

* * *

### ٤ـ لێنیە:

هەروەك (کامیل فلامییریونی) فەرەنسەیی لەکتێبەکەی خۆیا بەناوی (خوا لەسروشتا) بەدەم ئەم زانا سروشت ناسەوە دەڵێت: «خوا ئەزەلی و هەمیشەییەو ئاگای لەهەمووشتێکەو توانای بەسەر هەموو شتێکداهەیە، خوام لەجوانی صنعەتەکانیا بۆ دەرکەوتووە. کاتێ بیر لەو جوانیو ووردەکارییانە دەکەمەوە، سەرسام و سەراسیمە دەبم، ئای چ توانایی و چ حیکمەتو چ داهێنانێکی لەدروست کراوەکانیا بەدیهێناوە!! هەر لەبچوکترین شتەوە بیگرە تاگەورەترینیان.

ئەو سودو قازانجەی لەم بوونەوەرەوە بەدەستیان دێنین شایەتی

ئەوەدەدەن کە رەحمەتی ئەو خوایەی بوونەوەری بۆ رامکردووین چەند گەورەو فراوانە!!

وەهەروەها رێکخستن‌و یەکخستن و کەمالی ئەم بوونەوەرە هەوالی حیکمەتی فراوانی خودامان پێدەدات . وەهەروەهاتازەکردنەوەی بەردەوامی ئەم بوونەوەرەو پاراستنی لەتیا چوون،دان بەگەورەیی و رێزی خوادا دەنێت».

* * *

## ٥ـ هاربەرت سپنسەر:

ئەم فەیلەسووفە ئینگلیزییە، لە پەیامەکەیا کەلەبارەی پەروەردەوە نووسیویەتی، لەم بارەوە دەلێ:«زانیاری دژ بە خەرافاتە، بەلاّم دژ بەدین نییە، شتێکی زۆر لەگیانی موسقۆفی‌وزندیقی لە زانیارییەکانی سروشتا بلاّوکراونەتەوە، بەلاّم ئەو زانیارییە ساغ‌و دروستەی کە لەرووکەش تێپەڕیوەو بەناخی حەقیقەتەکان گەیشتووە، بەرییە لەوگیانی موسقۆفییە. زانیاری سروشت دژ بەدین نییە، رووکردنە زانیاری سروشت عیبادەتێکی بێدەنگ‌و صەدایە. وەبەشێوەیەکی بێدەنگ گران بەهایی‌و بەنرخی ئەوشتانە دەسەلمێنێ کە دەخرێنە ژێر زەرەبینەوەو دەتوێژرێنەوە، ئینجا بەخالقەکەیشیان. وەنەبێ ئەم رووکردنە عیبادەتە بەشێوەیەکی دەمی و زارەکی بێ ،نە، بەلکو تەسبیحاتێکی خوایە بەشێوەیەکی عەمەلی‌و بەکردەوە پیشاندان.

وەنەبێ ڕێزگرتنێکبێ بەدەم ، بەڵکو ئەوڕێزگرتنە قوربانی کردنی کاتو بیرکردنەوەو کارکردن بەرهەمی هێناوە..

ئەوزانیارییەش بۆ ئەوەی ئینسان حالی بکات کە : دەرکی هۆی یەکەم (کەخودایە) مەحالە ، ڕێگەی زۆرکاریو سەپاندن ناگرێتە بەر ، بەڵکو ڕێگایەکی ڕوونترو شێوازێکی ئاسانتر بۆ تێگەیشتنمان لەو مەحالە دەگرێتە بەر، بەو جۆرە لەهەموو لایەنێکی ئەو سنوورانە ئاگادارمان دەکات کەتێپەڕنیان مەحالە، ئینجا زۆر بەنەرم و ئارامی لەپەنای ئەو کۆتاییەدا دەمان وەستێنێت و دوای ئەوە چۆنیەتییەکمان پیشان دەدات کەلەگەڵ بچکۆلەیی عەقلی ئینسانیدا هەڵناسەنگێنرێ ولەبەرامبەر ئەوەوە عەقڵ تیا دەچێت».

ئینجا نموونە لەسەر قسەکانی دێنێتەوەو دەڵێت:«ئەو زانایەی تنۆکێ ئاو دەبینێتو دەزانێت کە، بە: ڕێژەیەکی تایبەت لەئۆکسجینو هایدرۆجین پێکهاتووەو بەجۆرێك ئەگەر ئەو ڕێژەیە بگۆڕرێ شتێکی تری لێ دەردەچێ جگە لەئاو، ئەو زانایە بڕوای بە توانایىو کاربەجێییو زانیاری فراوانو مەزنی ئەو خالقە زۆر گەورەترو بەهێزترە لەکەسێکی‌تر کەسروشت زان نەبێو تەنیا بەتنۆکێ ئاوی بزانێو هیچی‌تر.

وە هەروەها ئەوزانایەی کە دەنکە تەرزەیەك دەبینێو دەیخاتە ژێر میکرۆسکۆبەکەیەوەو دەبینێ چ ئەندازیاری و هەندەسەیەکی جوانی

تیادایە، بێگومان ئەو زانایە پتر هەست بە جوانیو شیرینی یەزدانو کاریووردو بەجێی دەکات لەو کەسەی کە لەبارەی ئەو تەرزەیەوە هیچ شتێك نازانێ ئەوە نەبێ کە بارانێکەو سەختی سەرماو سۆڵە بەستوویەتی».

قسەی زانایانی بوونەوەر لەم بارەیەوە نایەتە ژماردن، ئەوەی لێرەدا باسمان کرد بەسە، لەراستیدا ئێمە تەنها بۆیە ئەو قسانەمان وەك بەڵگە هێنایەوە تا لاوەکانمان بزانن کە ئاینەکەیان لەلایەن خوای بەرزو مەزنەوە پشتیوانی دەکرێ، زانیاریش جگە لە بەهێز کردنو پشتیوانی کردنی هیچی تری لەدەست نایە. ئەمەش لەراستیدا دەبێتە بەڵگەی راستیو دروستی ووتەی پیرۆزی خوای گەورە کە دەفەرموێ: «لە داهاتوودا نیشانەو بەڵگەکانیان لە هەریەکەوەو لەناو خودی خۆیشیاندا پیشان ئەدەین، تا بۆیان دەرکەوێو روون بێتەوە کە ئەو خوایەکی هەقو راستە، بەس نیە بۆ بەلگە لەسەر گەورەیی خوای تۆ کە ئەو ئاگاداری هەموو شتێکە؟»[1]

## هەندێك ئایەتو حدیث دەربارەی سیفەتەکانی خوا:

لەقورئانی پیرۆزدا چەند ئایەتێكو لەسوننەتی خاوێنی پێغەمبەریشدا ﷺ چەند

(١) مانای ئایەتی ژمارە (٥٣) لە سورەتی (فصّلت).

فەرموودەیەك هەن لەرواڵەتا واپیشان دەدەن کەخوای تەبارەك وەتەعالا لەمەخلوقاتی خۆی دەچێت لەهەندێ صیفەتەکانیا..

بەشێوەی نموونە هەندێکیان باس دەکەین و پاش ئەوەش لەو بارەوە چ قسەیەك کراوە باسی دەکەین ، داوا لە خوا دەکەین کۆمەکمان بێ بۆ پیشاندانی رووی حەق لەم باسو مەسەلەیەدا کە خەڵکێکی زۆر دەمەقاڵەو قسە گەرمییەکی زۆریان تیاکردووەو تائەم سەردەمەی خۆیشمان درێژەی کێشاوە ، داوا کارین خوا لەهەڵخلیسکان لامان بداتو راستی و حەق بهاوێتە دڵمانەوە، هەر ئەومان بەسەو ئەویش باشترین پشتیوانە.

## چەند نموونەیەك لەئایەتەکانی صیفات:

١ـخوای تەعالادەفەرموێ: «کل من علیها فان ویبقی وجه ربك ذوالجلال والإکرام» الرحمن/٢٧. واتە: هەرچی والە سەر زەویدا تیا دەچێت، تەنها رووی پەروەردگارت دەمێنێتەوە، کە خاوەنی گەورەیی و رێزە..

٢- خوای تەعالا دەفەرموێ: أ- «ولقد مننا علیك مرة أخری ،إذ أوحینا إلی أمك ما یوحی أن اقذفیه فی التابوت فاقذفیه فی الیم ، فلیلقه الیم بالساحل ، یأخذه عدولی وعدوله ، وألقیت علیك محبة منی ، ولتصنع علی عینی» طه/٣٩.

واتە: بێگومان جارێکی تریش نیعمەتی خۆمان بەسەرا رشتیت،

بەیادی بێنەوە کاتێ ڕێی ڕزگاری تۆمان پیشان دایکت دا و نیلهامانکرد کە بتخاتە ناو صندوقێکەوە و صندوقەکەیش بدات بەدەم ڕووباری نیلەوە ، -دایکت ئەم کارەی کرد-ڕووباری نیلیش تۆی بەرەوکەناری ڕووباربرد ، فیرعەونی دوژمنی خوا تۆی دەرهێناو لەماڵی خۆیا بەخێوی کردی ولە دوا ییشدا بوویە دوژمنی خۆت ،خۆشەویستی خۆمم ڕشت بەسەرتا- فیرعەون و ژنی فیرعەونیش تۆیان خۆشویست - تا لەبەرچاو خۆما دروست بکرێیت ، واتە: بەو جۆرەی خۆم دەمەوێت پەروەردە بکرێیت وپێبکەیت وخۆم چاو دێرت بووم..

پ - وەهەروەها خوای تەعالادەفەرموێ: ***«وأوحي إلى نوح أنه لن يؤمن من قومك إلامن قد آمن،فلا تبتئس بما كانوا يفعلون،واصنع الفلك بأعيننا ووحينا،ولا تخاطبني في الذين ظلموا إنهم مغرقون»*** هود/٣٧.

واتە: خوا وەحی بۆ نووح نارد : کە،جگە لەوەی ئیمانی هێناوە ئیدی کەسێکی تر لەو خزمانەت ئیمان ناهێنێت،بەهۆی ئەو کارە ناپەسەندانەیانەوە کە ئەنجامی دەدەن خەمبارو نارەحەت مەبە،و بە وەحی ئێمەو لە بەرچاو ئێمەوە کەشتییەکە دروست بکە . - واتە: بەفەرمانی ئێمەو بەچاودێری ئێمە دروستی بکە،و ئیمانداران ڕزگار دەکەین ئیتر - لەبارەی ئەوانەی ستەمکار بوون قسەم لەتەکا

نەکەیت ، چونکە ئەوانە نقوم دەبن و دەخنکێن ..

وە هەروەها هەموو ئایەتێکی تریش کە وشەی چاو {العین} ی تیا بەکار هێنرابێ بۆ خوای تەبارەك وەتەعالا..

٣ـ خوای تەعالا دەفەرموێ:أ. «إن الذین یبایعونك إنما یبایعون الله ، ید الله فوق أیدیهم ، فمن نکث فإنما ینکث علی نفسه، ومن أوفی بما عاهدعلیه الله فسیؤتیه أجرا عظیما » الفتح/ ١٠

واتە: بێگومان ئەوانەی بەیعەت بەتۆ دەدەن‌و پەیمانت لەگەڵا دەبەستن لەراستیدا بەیعەت بەخوا دەدەن‌و پەیمان لەگەڵ ئەودا دەبەستن، دەستی خوایش لەبان دەستیانەوەیە ، ئەوەی پەشیمان بووەوەو پەیمانەکەی نەبردەسەر زیانی ئەو پەیمان شکانەی بۆ خۆیەتی‌و خۆی تووشی رەنج‌و ئازار دەبێت، وەئەوەش ئەو پەیمانەی بە خواداوە گەر بیباتە سەرو بە جێی بێنێ خوا پاداشتێکی گەورەی دەداتەوە .

ب ـ وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ : « وقالت الیهود ید الله مغلولة غلت أیدیهم ولعنوا بما قالوا ، بل یداه مبسوطتان ینفق کیف یشاء..» المائدة/٦٤.واتە: یەهود گوتیان: خوا دەستی بەستراوەو رزقمان نادات، دەستیان ببەستری‌و خێریان لەدەست نەبێتەوە ـ بۆ خۆیان و قسەیان ـ وەبەهۆی ئەو قسەیانەوە لەعنەتیان لێ کراو لە رەحمەتی خوا بێبەش بوون و، خوا دەستی

نەبەستراوە ، بەڵکو دەستی کـراوەیە و چۆنی بوێت ئاوەهـا دەی بە خشێت.

ج- وەلەم ئایەتەشدا : « أولم يروا أنا خلقنا لهم مما عملت أيدينا أنعاما فهم لها مالكون» يس/٧١. واتە : ئەو کافرانەی بتەکانیان دەکەنە شەریك و هاوەڵی خوا ئایا نابینن ئەوەی بەدەستی خۆمان بۆمان دروستکردوون و ئەواغان کردۆتە خاوەنیان و چۆنیـان بوێ بەکاریان دێنن ؟!

٤- وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: أ -« لايتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله في شئ إلا أن تتقوا منهم تقاة، ويحذركم الله نفسه وإلى الله المصير» آلعمران/٢٨.

واتە: بائیمانداران جگە لەهاو باوەڕانی خۆیان کافران نەکەنە سەرپەرشت و گەورەی خۆیان ، ئەوەی کافران و بێبڕوایان بکاتە گەورەو سەرپەرشتی خۆی فری بەسەر دینی خواوە نییە ونامێنێ ، مەگەر ترسێکی زۆریان لێیان هەبێ و بەڕواڵەت پێیان ڕازی بن - نەك لەدڵەوە - بۆ ئەوەی خۆتان لەشەڕیان بپارێزن، ئاگاتان لە خۆتان بێ، لایەنگری رواڵەتیتان بۆیان، نەبێتە لایەنگری راستەقینە بۆیان، چونکە خوا ئاگادارە بەسەر دڵ و دەروونتاناو بەسزای خۆی دەتان ترسێنێ و ئاگادارتان دەکاتەوە، ئەوەش بزانن ئەگەر بەدڵ لایەنگیریان

بن ، لەسزای خوایی رزگارتان نابێتەوە بۆلای خودایش دەگەڕێنەوەو بەرپرسیار دەبن ..

پ ـ وە هەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ : «وإذ قال الله: یاعیسى ابن مریم أأنت قلت للناس: إتخذوني وأميّ إلهين من دون الله؟ قال: سبحانك ما یکون لي أن أقول مالیس لي بحق، إن کنت قلته فقد علمته، تعلم مافي نفسي ولا أعلم مافي نفسك ، إنك أنت علام الغیوب »المائدة/١١٦.

واتە: ئەی پێغەمبەر، بۆ خەڵکی باس بکە : رۆژێك دێت خوا لە هەموو پێغەمبەران دەپرسێت: چییان بەنەتەوەکانیان گوتووە، لەو کاتەدا خوا دەڵێ : ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا تۆ بە خەڵکیت گوت: من ودایکم بە خوا بزانن‌و (الله) مەپەرستن؟ ئەویش لەوەڵامی خوادا دەڵێ: پاك‌وبێ عەیبی بۆتۆیە ، من بۆم نییە بوختانی وابکەم‌و قسەی واناحەق بکەم. من جگە لە حەق قسەیەکی ترم نەکردووە، ئەگەر قسەی وام گوتبێت بێگومان پێی دەزانیت‌و ئاگات لێیەتی، تۆ ئاگات لە نهێنی‌و ئاشکرای منەو دەزانی چی لەدەروونمدا شاراوەیە ، بەڵام من ئاگام لەشاراوەو نهێنییەکانی تۆ نییەو نازانم چی لەدەروونتایە بێگومان تۆ زۆر ئاگاداری لە هەموو شتێك و پێی دەزانیت .

ە ـ وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: « الرحمن على العرش

استوى» طه/٥. واته: ئەو خوایەی کەئاسمانانو زەوی دروست کردووە (الرحمن)ەو لەسەرعەرش دانیشتوە (دانیشتنێك شیاوی خوابێ، چونکە دانیشتنی خوا بەو جۆرە نییە کەئێمە بێت بە خەیالماندا. لەبەر ئەوە هەندێ لە زانایان دەڵێن : واتە: دەسەڵاتی گرتە دەستو فەرمان رەوایی زەویو ئاسمانی کردو سەرپەرشتییان دەکات )

وەهەروەهائەوئایەتانەی تریش کەباسی (إستوى) دەکەن. (١)

* * *

٦ـ وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: أـ «و **وهو القاهر فوق عباده ويرسل عليكم حفظة حتى إذا جاء أحدكم الموت توفته رسلنا وهم لا يفرطون**» الانعام/٦١.

واتە: خوا دەسەڵاتی تەواوی بەسەر بەندەکانیا هەیەو ئەوان ملکەچی فەرمانو دەسەڵاتی خوان، وەهەروا وێڵ ناکرێن ، خوا پارێزگارانێك دەنێرێتە سەرتان و چاودێرتانن وهەموو کردەوەیەکتان و هەمو بزوتنەوە یەکتان بۆ دەنوسرێت، تاکاتێ مردنی یەکێکتان دێت و یەکێك لەفریشتەکانمان گیانی دەکێشێت ، بێ ئەوەی لـەرکاتـە دیاریکراوەی خۆی پێش یا پاشی بخەن ..

---

١ـ لەسوورەتەکانی: {البقرة/ ٢٩ ،الاعراف/ ٥٤ ،یونس/ ٣ ،الرعد/ ٢ ،طه/ ٥ ،الفرقان/ ٥٩ ، السجدة/ ٤ ،فصلت/ ١١ ،الحدید/ ٤ ،}دا وشەی{استوى}بۆ خوا بەکار هێنراوە.. وەرگێر..

ب ـ وەهەروەها خوا دەفەرموێ: «**أأمنتم من في السماء أن يخسف بكم الارض فإذا هي تمور**» الملك/١٦. واتە: ئەی بێبڕوایان ،لەو خوایە دلنیان کە ـ بەلاتانەوە وایە ـ لەئاسمانە بتان باتە خوارەوە بەناخی زەویدا ، ئینجا ئەو کاتە زەوی گێژ بخواتو قووتتان بدات و خاكو خۆڵێکی زۆر بەسەرتانا کەڵەکە بکاتو ڕێی ڕزگار بوونتان نەبێت ؟؟

ج ـ وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: «**من كان يريد العزة فلله العزة جميعا ، إليه يصعد الكلم الطيب والعمل الصالح يرفعه ، والذين يمكرون السيئات لهم عذاب شديد ، ومكر أولئك هو يبور**» فاطر/١٠. واتە: ئەوەی دەیەوێت لەدنیا وقیامەتا عەزیزو سەر بەرزبێ ، با فەرمانەکانی خوا بەجێبێنێو لەسەر بەرنامەکەی خوا بڕوات بەڕێوە خوا عەزیزو سەربەرزی دەکات، چونکە هەرچی سەربەرزیو بەنرخی هەیە هەمووی خوا دەیدات ولای خودایە . قسەی پاك و گوتنی وشەی یەکتاپەرستی بۆلای خوا بەرز دەبێتەوە و خوا پێی دەزانێو کردەوەی چاکیش بەرزدەکاتەوە ، واتە: قبوولی دەکات ، ئەوانەی فێڵی خراپ لەموسلمانان دەکەن سزایەکی سەختیان دەدرێت و فێڵی ئەو خراپە کارانەیش زوو بۆ خاوەن دڵان دەردەکەوێتو پووچ دەبێتەوە و لەناو دەچێت.

وەهەروەها ئەو ئایەتانەی تریش ، کەوا پیشان دەدەن خوا

لەجێیەکدا بێت ..

٧ـ وەهەروەها خوای تەعالا دەفەرموێ: أـ «إن الذين يؤذون الله ورسوله لعنهم الله في الدنيا والآخرة وأعدلهم عذابا مهينا» الاحزاب/٥٧. واتە: بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەری خوا دەدەن ، خوا لەدنیا و قیامەتا لەعنەتیان لێ دەکات و لەرەحمەتی خۆی بێبەشیان دەکات وسزایەکیان بۆ ئامادە دەکات سەرشۆڕو رسوایان بکات.

ب ـ وە هەروەها فەرمورویەتی: «ومريم ابنة عمران التي أحصنت فرجها فنفخنا فيه من روحنا وصدقت بكلمات ربها وكتبه وكانت من القانتين» التحريم/١٢.

واتە: بۆنموونەی ئافرەتی ئیماندار مەریەمی کچی عیمران باس دەکات، ئەو مەریەمەی خۆی لەداوێن پیسی پاراست و ئێمەش لەرۆحی خۆمان فوومانکرد بە مەریەمدا ، وەبڕوای بەشەریعەتی خوا هەبوو ، بڕوای بەپەیام و کتێبەکانی خوا هەبووڕ لەریزی ئەوانەدا بوو کە فەرمانبەرداری خوان.

ج ـ وەهەروەها دەفەرموێ :.«كلا إذا دكت الارض دكا دكا ، وجاء ربك والملك صفا صفا وجئ يومئذ بجهنم يومئذ يتذكر الإنسان وانى له الذكرى ؟» الفجر/٢٢.

واتە: نەخێر وانییە ،کەئەوان مالی دنیا کۆدەکەنەوەو حەرام

یاحەلاڵ گوێی پێنادەن‌و وانازانن ڕۆژی قیامەت هەبێت ، بەڵێ ، ڕۆژی قیامەت دێت و کاتێ‌کەزەوی پارە پارەکراو هەرچی شاخ‌و بەرزی‌هەیە هەمووی یەکسان‌کرا ، وە پەروەردگارت هات‌و فریشتە پۆل پۆل ڕیزیان بەست و هاتن . وەدۆزەخ بۆتە ماشاکەران دەرکەوت ، ئەوکاتە ئادەمیزاد هەرچی لەجیهانا کردبێ بیری دەکەوێتەوە ، بەڵام تازە چ سوودێکی هەیە

* * *

### چەند نموونەیەك لەو فەرموودانەی صیفات :

وەك لە ئایەتەکاندا هەبوو لە فەرموودە پیرۆزەکانیشا چەند وشەیەك باس‌کراون‌و دەدرێنە پاڵ خودا وەك : دەموچاو و دەست‌و شتانێکی تریش لەو بابەتە . وە هەروەها لە فەرموودەیەکی زۆرا چەندەها وشەی تر لەبارەی خوای تەبارەك وە تەعالاوە هاتوون ئێمە هەندێکیان دێنین و باسیان دەکەین ، لەو نموونانە :

۱ـ ئەبو هرەیرە ـ خوالێی رازی‌بێ ـ دەڵێ : پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وآلەوسلم ـ فەرمویەتی :***«خلق الله آدم علی صورته طوله ستون ذراعا، فلما خلقه قال: إذهب فسلم علی أولئك ـ النفر من الملائكة جلوس ـ فاستمع ما یحیونك فإنها تحیتك وتحیة ذریتك، فقال: السلام علیکم، فقالوا: السلام علیك ورحمة الله، فزادوه ـ ورحمة الله ـ فكل من یدخل الجنة علی صورة***

*آدم ، فلم يزل الخلق ينقص بعد حتى الآن »* رواه البخاري ومسلم .(١)

واته: خوای تەعالاتادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردووە ، ئادەم شەست باڵ درێژ بووە ، کاتێ دروستی کرد فەرمانی پێکردوو و فەرمووی پێی: برۆ سڵاو بکە لەو کۆمەڵە فریشتەیە کەدانیشتون، ئەوان چۆن وەڵامی سڵاوەکەیان دایتەوە ، ئەوە سڵاوی خۆت و وەچەکانت « ذريتك» دەبێت باش گوێی بۆبگرە، ئادەم گوتی : السلام عليكم ، ئەوانیش لەوەڵامدا گوتیان: السلام عليك ورحمة الله ، وشەی «ورحمة الله»یان زیاد کرد لە وەڵامی سڵاوەکەی ئەوا، ئەوەی دەچێتە بە هەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەم دەچێتە بە هەشتەوە . خەڵکی بچووك دەبنەوە و تائێستاش لەباڵادا کەم دەکەن .

* * *

٢ـ ئەنەسی کوڕی مالیك ـ خوا لێی رازی بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ـ صلى الله عليەوآله وسلم ـ فەرمووی :« *لاتزال جهنمُ يُلقىٰ فيها ، وتقولُ: هل من مزيد؟ حتى يضعَ ربُّ العزة فيها قدمَه، فينزوي بعضُها إلى بعض ، وتقولُ :قط قط بعزّتك وكرمكَ ، ولا يزالُ في الجنة فضلٌ حتّى يُنشىءَ اللهُ لها خلقا فيُسكنهم فضل*

---

١- تەماشای [فتح الباري في شرح صحيح البخاري] بکە، بەرگی پانزە لاپەڕە [٢و٣] وە بەرگی شەشەم لاپەڕە [٢٧٨تا ٢٨٠] . لەبەرگی پانزەهەمدا شێخی [ابن حجر] باسی جیاوازی ئەو راوبۆچوونەی زانایان دەکات لەبارەی راناو [ضمير] ی [صورته] بەوە، ئایا بۆ ئادەم دەگەڕێتەوە ، یا بۆخوا؟ ئەگەر بۆئادەم بوو بەعنی چی؟ وەئەگەر بۆخوابوو بەعنی چی؟.. وەرگێر

*الجنة*» رواه البخاري ومسلم .(١)

واته: بەردەوام جەهەننەم تاوانبارانی تێدەخرێو ئەویش دەڵێ: ئایا هی زیاتر هەیە؟ - داوای زیاتر دەکات- تاخوای خاوەن عیززەت و دەسەڵات پێی تێدەخات وئەویش هەندێکی لە هەندێکی تریا کرژ دەبێتەوەو دەچێتە یەكو دەڵێ: بەسمە، بەسمە .. قەسەم بەگەورە یی و رێزی تۆ ئیتر داوا ناکەم . وە بەهەشتیش بەردەوام شوێنی زیادەی هەیە، تاخوای تەعالا سەرلەنوێ کەسانێکی تریان بۆ دروست دەکاتو لەو شوێنە زیادانەی بە هەشتا جێگیریان دەکات .

* * *

٣ - ئەبوهورەیرە - خوالێی رازی بێ - دەڵێ: پێغەمبەر - صلى الله عليه وآله وسلم - فەرموویەتی: «*لَلّهُ أشدُ فَرَحاً بِتوبةِ أحدِكم مِنْ أحدِكم بضالَّتِهِ إذا وَجدها*» رواه البخاري ومسلم.(٢).

واته :یەکێك لەئێوە وڵاخو توێشووی سەفەری وندەکات و ئینجا بەدۆزینەوەکەی چەند شادمان دەبێت ،خوا بەگەڕانەوە ی عەبدی خۆی لەوکەسە شادمانتر دەبێت ..

---

١-صحيح مسلم بشرح النووي:١٧/ ١٨٤. وفتح الباري بشرح صحيح البخاري: ٨/ ٤٨٢. واللفظ لمسلم ..

٢-صحيح مسلم بشرح النووي: ١٧/ ٦٠. وفتح الباري بشرح صحيح البخاري: ١١/ ٨٨. واللفظ لمسلم

***خەڵکی لەم بارەوە دەبنە چوار بەش:***

١ـ دەستەیەکیان رواڵەتی وشەکە چۆنە وا وەری دەگرن . لە بەر ئەوە ئەو خەڵکە چۆن دەموچاویان هەیە وادادەنێن خوایش ئاوەها دەموچاوی هەیە ، یا دورودەستی وەك دەستی ئەوانی هەیە ، یا پێکەنینی وەك پێکەنینی ئەوان هەیە .. هەروەها.. تاوایان لێهات هەندێکیان خوایان لەشێوەی پیرێکدا داناو هەندێکی تریشیان بەشێوەی لاوێك. ئەم دەستە پێیان دەڵێن : (المجسمة و المشبهة) واتە: لەش و جوستە بۆ خوا دادەنێن و پێیانوایە لەمەخلوقات دەچێت. ئەوانە فریان بەئیسلامەوە نییەو لەو بارەوە بەشێکیان بەرنەکەوتووەو قسەکانیان بەشی راست و دروستی تیانییە. بۆ پەرچی قسەکانیان ئەو ئایەتانە بەسە کە خوای تەعالا دەفەرموێ :***«... لیس کمثله شيء وهوالسمیع البصیر»***الشوری/١١. واتە:شتێك وەك وێنەی خوا نییەو خوایش بیسەروبینایە. وەهەروەها دەفەرموێ:***«قل هوالله أحد الله الصمد، لم یلد ولم یولد، ولم یکن له کفوا أحد »*** واتە: بلێ: ئەو خوایەی من (الله) یەو تاك و تەنیایە، خوا پێویستی بەکەس نییەو هەموو کەس پێویستی بەو هەیە، کەسی لێنابێ و لەکەسیش نەبووە، وەهیچ هاوتاو مانەندێکی نییە.

* * *

## ٢ ـ دەستەی دووەم:

ئەم تاقمەش واتای وشەکانیان بەتەواوی لەکار خستووەو مەعنا بۆ ئەو وشانە دانانێن ، و دەیانەوێ واتای ئەو وشانە لە خوای تەبارەك وەتەعالا دووربخەنەوە. لای ئەوان خواقسەناکات، نابینێ، نابیستێ ، چونکە ئەم جۆرە صیفەتانە بەدەمو زمانوگوێ ئەنجام دەدرێن و دێنە دی . دەبێ خوایش لەم جۆرە ئەندامانە بەدوور بێ . بەم جۆرەصیفەتەکانی خوا لەکار دەخەن وپێیان وایە رێزی خوا دەگرنو بەو جۆرە تەقدیسی دەکەن .. ئەمانەش پێیان دەوترێ:(**معطلة**) یەعنی صیفەتەکانی لەکاردەخەنو دەیان وەستێنن ، هەندێ لەزانایانی مێژووی عەقیدەی ئیسلامی بە جەهمییە(**الجهمیّة**)ناویان دەبەن.

پێم وانییە ئەوەی کەمێ عەقڵو ژیری هەبێ قسەی بابردوویوا بە ڕەوا بزانێ،ڕۆژگاریش پووچەڵی بۆ چوونەکەی ئەوانی ـ سەلماند. ئەوەتە هەندێ مەخلوقات هەیە . قسەکردنو بینینو بیستنیشیان هەیەو بەهۆی هیچکام لەو ئەندامانەوە ئەنجام نادرێن . ئیتر چۆن بەبێ ئەندامی زمان حەقتەعالا قسەی بۆناکرێت؟! خوای تەعالا زۆر لەوە بەرزو بلندترەو لەو بوختانەدوورو بەرییە.

ئەم دوو جۆرەیان بۆچونیان پووچو ناڕەوایەو جێگەی سەرنجدان نین، دوو راو بۆچوونی ترمان لەپێش ماوە ، کەئەوانەش جێگەی تێبینی و سەرنجی زانایانی عەقیدەن. ئەوانەش رای پێشینانو

زانایانی شوێنکەوتووی ئەوانن. (السلف والخلف).

***ڕێڕەوی پێشینان «مذهب السلف»:***

٣- پێشینان - خوالێیان ڕازی بێ - گوتوویانە: ئەو ئایەت و فەرموودانە چۆن هاتوون بەو جۆرە ئیمانمان پێیانەو واز لەڕوونکردنەوەی مەبەستەکەیان دێنین بۆ خوای تەبارەك وەتەعالا. ئەوان دان بەبوونی دەست و چاو و پێکەنین و دانیشتن و سەرسامیدا دەنێن . هتد .. بەلاّم دەڵێن مەعنای هیچکام لەوانە نازانین، ئێمەوازیان لێدێنین بۆخوای تەعالا، چونکە باش نایانزانین. بەتایبەت داوامان لێکراوە لەو بارەوە ڕۆنەچین. هەروەك لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر- صلی الله علیه وآله وسلم - دەفەرموێ: ***«تفكّروا في خلقِ اللهِ، ولا تَتفكّروا في اللهِ، فإنكمْ لنْ تَقْدُروه قَدْره»***

(واتە: بیر لەدروستکراوەکانی خوا بکەنەوە، بیر لەخودی خوا مەکەنەوە، چونکە ئێوە تواناتان نییە ڕێزی خۆی بدەنێ.)

حافظی عیراقی دەڵێ: ئەبو نەعیم لە (الحلية) دا بەسەنەدێکی لاواز «ضعيف» باسی کردووە، وە ئەسفەهانیش لە (تەرغیب و تەرهیب) ەکەیدا بەسەنەدێکی لەوساغتر ریوایەتی کردووە، وەهەروەها (ابوالشیخ) یش ریوایەتی کردووە، لەگەڵ ئەوەدا هەموویان -ڕەحمەتی خوایان لێبێ - لەوە دڵنیان کە لە نێوان خواو خەڵکیدا لێچوواندن و (موشابەهە) نییە. وەئەوەش قسەکانیانە لەوبارەو کە بۆت

باس دەکەم:

أ ـ ئەبول قاسمی(اللالكائی) لە«أصول السنة»دا لەدەم (محمد)ی کوڕی(الحسن)ی هاوەڵی ئیمام ئەبو حەنیفەوە ـ بەرەحمەت بن ـ دەگێرێتەوەو دەڵێ:هەموو«شەرعزانان لە رۆژهەڵات‌و رۆژئاوادا یەکران لەوەدا کەباوەڕ واجبە بە قورئان‌و هەموو ئەوفەرموودانەی متمانە پێکراون لەبارەی صیفەتی خوای تەعالاوە وەریان گرتووەو لە پێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیه‌وآله وسلم ـ ریوایەتیان کردووە. بەبێ تەفسیرو بێ وەصفکردن ،وە بێ‌لێچوواندن‌و«تشبیه».

«ئەوەی ئەمڕۆ شتێك لەوانە تەفسیر بکاتەوە، لەو حالەتە چووەتە دەرەوە کەپێغەمبەر ـ صلی الله علیه‌وآله وسلم ـ ی لەسەربووە، وەلەکۆمەڵ دورر کەوتۆتەوە ، چونکە ئەوان نەباسیان کردوون‌و نەتەفسیر، بەلاّم ئەوەی لەکتێب‌و سوننەتدابووبێ، فتوایان پێداوەو ئیتر بێ دەنگ بوون».

ب ـ وە(خلاّل)لەکتێبی(السنة)دا بەدەم(حەنبەل)ەوە دەڵێ: حەنبەل لەکتێبەکانی خۆیا وەك کتێبی(السنة والمحنة)دا گوتوویەتی:«لەبارەی ئەوفەرموودانەوە کە ریوایەت‌کراون و دەڵێن:«خوای تەبارەك وەتەعالا دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا» وە«خوادەبینێت..»وە«خوا پێی‌دەخاتە ناو .. یا پێ‌دەنێ‌بە.»(1) وەئەوانەی تریش کەلەم بابەتەن، ـ ئایا چۆنیان

(1) لەلاپەرە (٩٠) دا باسمان کردن ، سەرێك لەوێ بدە ..

بزانین؟

ئەبو(عبدالله)یش وتی: باوەڕمان پێیان هەیەو بەراستیان دەزانین ، بەبێ ئەوە سەرلجی چۆنیەتی‌و واتایان بدەین، وەهیچیشیان بەدرۆ نازانین‌و پەرچیان نادەینەوە،وەدلنیاین ئەوەی لەلایەن پێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیه‌وآله وسلم ـ هاتبێ حەق‌و تەواوە ـ ئەگەر رێگەی گەیشتنەکەی بەئێمە ساغ‌و دروست بێ . قسەی خوا نادەینەدواوە، وەصفی خوای تەعالا بەشتێك ناکرێ جگە لەوەی کە خۆی وەصفی خۆی پێکردووە، ئەویش بەبێ سنووررو بێ کۆتایی‌هاتن ، چونکە هیچ شتێك لەوێنەی خوانییە.»

ج ـ(حەرمەلە)ی کوڕی(یەحیا)دەڵێ: لە(عبدالله)ی کوڕی(وەهەب )م بیست دەیوت:لە (مالیکی) ی کوڕی(ئەنەس)م بیست دەیوت: ئەوەی شتێك لە وەصفی خوای تەعالا بەئەندامێکی خۆی بکات، بۆغوونە لەم ئایەتەدا:« وقالت الیهود یدالله مغلولة» (٢) هێما بەدەستی بکات‌و بیبات بۆگەردنی، وەلەم ئایەتەدا« .. وهوالسمیع البصیر»(٣) دا هێما بۆچاوو و گوێی خۆی بکات، یا هێما بۆ شتێك لەدەستەکانی خۆی بکات، دەبێ ئەو ئەندامەی لێ بکرێتەوەو ببڕیت، چونکە تەشبیهی خوای بەخۆی کردووەو خوای لەخۆی چوواندووە.

---

(٢)المائدة/ ٦٤ واتە: بەهوود گوتیان:دەستی خوازنجیر کراوە ..

(٣)الشوری/ ١١واتە: خوا بیسەرو بینایە..

ئینجا (مالیك) گوتی: ئایا تۆ قسەکەی (بەرا ء)ت نەبیستووە کەباسی دەکات: پێغەمبەر - صلى الله علیه وآله وسلم - فەرموویەتی: لەقوربانیدا چوارشت دروست نین وناکرێنە قوربانی.. چۆن پێغەمبەر - صلى الله علیهوآله وسلم - بەدەستی ئیشارەی کردبوو، (بەرا ء)یش بەو جۆرە هێمای بەدەستی کرد، بەلاّم گوتی: دەستەکانی من لەدەستەکانی پێغەمبەر - صلى الله علیه وآله وسلم - بچووکترن. بەرا ء پێی ناخۆش بوو دەستەکانی پێغەمبەر - صى الله علیهوآله وسلم - «بشوبهێنێ» بەدەستەکانی خۆیەوە، لەبەر رێزو ئیحترامی پێغەمبەر - صلىالله علیه وآله وسلم - کە مەخلوقیشە، ئەی چۆن دەبێ وەصفی خالق بەشتێکی مەخلوق بکرێو بەو بشوبهێنرێ، لەگەلّ ئەوەدا کە هیچ شتێ لەوێنەی خوا نییە؟!

د -وە (ئەبوبکر)ی (ئەثرەم) و (ئەبوعەمر)ی (تەلەنەکی - الطلمنكي ) و (ئەبوعبداللە)ی کوڕی (ئەبی سەلەمە)ی (ماجیشون) لەم بارەوە قسەیەکی زۆر دەگێرنەوەو ئابەم جۆرە کۆتایی پێدێنن: «ئەوەی خوا وەصفی خۆی پێکردووەو لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ناوی هێناوە، بەوجۆرە ناوی لێدەنێینو ناوی دەبەین کە خۆی ناوی لێناوە، زۆر ناکەین لەخۆمان صیفەتێك جگە لەوانە دروست بکەین - نە زۆر دەڕزێن ونەکەم - نەئەمەو نەئەوە. ئینکاری شتێناکەین کە خۆی

وەصفی‌کردووە، زۆر ناکەین لە خۆمان بۆ زانینی شتێکیش کەخۆی باسی نەکردبێ ـ بێگوناهی لەدیندا ئەوەیە:لەکوێدا کۆتاییان پێهێنایت کۆتایی بێنییت،وەلەوەی بۆت دیاریکراوە تێپەڕ نەکەیت، راگیرکردنی دین لەوەدایە چاك بەچاك بزانی و خراپ بە خراپ، (مەعروف بناسی‌و ئینکاری مونکەربکەیت)ئەوەی بەشێوەی‌باش باسکرابوو، درێژەی پێدرابوو، دڵ پێی ئارام‌دەبوو، بنچینەکەی لەقورئان‌و سونندتا هەبوو،لەوانا باسکرابوو، پشتاو پشت‌زانرابوو، زانینی بەمیراتی بۆ ئوممەتی ئیسلامی مابووەوە، ـ ئەگەر ئاوهابوو ـ هیچ مەترسەباسی بکەو وەصفی پەروەردگارتی پێ‌بکە، مادام خوا وەصفی خۆی بەوشتەکردبێ. ئیتر تۆ تەکلیفی ئەوەت لێناکرێ چۆنیەتی‌و ئەندازەکەی بزانیت.

وەئەوەش دڵو دەروونت بە خراپی زانی‌و لەکتێبی پەروەردگارتا باسی نەکرابوو، وەلەفەرموودەی پێغەمبەرەکەتا ـ صلی اللە علیە وآلە وسلم ـ بەصیفەتی پەروەردگارت باس نەکرابوو، بۆزانینی ئەو صیفەتە زۆر لە عەقلت مەکەو بەزمانیشت باسی‌مەکە. چۆن خوا بۆخۆی لێی بێدەنگ بووە تۆش ئاوها لێی بێدەنگ بەو باسی‌مەکە.

چونکە ئەگەر زۆرت لە خۆت کردو رووت لە خۆت نا بۆ زانینی شتێك کە خوا وەصفی خۆی پێ نەکردبوو،وەك ئەوە وایە ئینکاری شتێك لەوانە بکەیت کە وەصفی خۆی پێ کردووەو باسی کردووە، چۆن

بەلاتەوە گوناهێکی گەورەیە ئەگەر کەسانێك ئینکاری صیفەتێ لەو صیفەتانەبکەن کە خوا باسی کردوونو وەصفی خۆی پێ کردوون، دەبێ ئەوەشت بەلاوە ناوهاگەورەبێ ئەگەر کەسانێك وەصفی خوایان بەشتێك کرد کەخوا وەصفی خۆی پێ نەکردبوو، وەلەناو وصیفەتە کانیا نەبوو.

واللە ئەو موسلمانانەی ـ چاکە دەکەنو بەچاکەکردنەکەی ئەوان چاکە بلاو دەبێتەوە و لەناو خەلکیدا دەناسرێ، وەئینکاری خراپە دەکەنو بەخۆ دوورگرتنەوەیان لەو خراپەیە وای لێدێت لەناوخەلکا نامۆ دەبێت وکەس هەوالی نازانێ، وەئەوەی خوا لەقورئانا وەصفی خۆی پێکردبێو وێنەی ئەوەش کەلە پێغەمبەرەکەیەوە پێیان گەیشتبێ، تەنیا ئەوە دەبیستن ـ ئەوموسلمانانە بەراستی سەربەرزو سەرفرازن.. دلی هیچ موسلمانێك نەخۆش ناکەوێت لەباسکردنی شتێکا خوا ناوی بردبێو ناوی لێنابێ.

هیچ ئیماندارێك زۆری لێناکرێ ئەندازەو چۆنیەتی صیفەتێك بزانێ، کەباس نەکرابێ، وەناوی صیفەتێك لە غەیری خواوە وەرگرێ بۆ خوا، بەلام ئەو صیفەتەی پێغەمبەر ـ صلی اللە علیە وآلە وسلم ـ ناوی بردبێو باسی کردبێ کە صیفەتی خوایە وەك ئەوەوایە خوا خۆی ناوی هێنابێو باسی کردبێ. ئەوا ئـــەی عیلمیان بە شتێ نـــە بـــوو دەوەستنو بەنەزانین قسەی لێ ناکەن ،ئەوانەی چۆن خوا وەصفی خۆی

کردووه وا وەصفی دەکەن و ئەوەی وازلێهێنابێ وازی لێدێنن، ئەوانە ئینکاری صیفەتێك ناکەن خواناوی بردبێ و صیفەتێکیشی بۆ دروست ناکەن خۆی ناوی نەبردبێ، چونکە حەقتەعالا شتانێکی وازلێ هێناوەو باسی نەکردوون و وەشتانێکیشی باس کردووە کەشیاوی ناوبردنبن، وەخوایش دەفەرموێ: *( و یتّبع غیر سبیل المؤمنین نوله ماتولی ونصله جهنم وساءت مصیرا )* النساء/١١٥.

واتە: ئەوەی جگە لەرێی ئیمانداران شوێن رێیەکی تر بکەوێ ،ئەو رێیەی بۆ ئاسان دەکەین کە گرتوویەتەبەر، بەلأم بەئاگری جەهەننەم داخی دەکەین و ئەویش خراپترین جێگەیە ..

خواحیکمەت بەئێمەو ئێوەش ببەخشێ و بمان گەیەنێتە ریزی پیاوچاکان ..

* * *

## *رێرەوی شوێنکەوتوان «مذهب الخلف»*

پێشتر بۆمان باسکردی کە پێشینان ـ رەحمەتی خوایان لێبێ ـ ئایەت و فەرموودەکانی صیفات چۆن هاتوون ئاوهائیمانیان پێیەتی، وە واز لەروونکردنەوەی مەبەست لەو صیفەتانە دێنن بۆ خوای تەبارەك وە تەعالا.. لەگەڵ ئەوەدا بروایان وایە :خوای تەبارەك وە تەعالا وەك مەخلوقاتی نییەو بەرییە لە(موشابەهە) و لێچووان بەمەخلوقیەوە..

(خەلەف)واتە: شوێنکەوتوان، یاجێگری ئەوان، یاجێنشینی ئەوان

دەڵێن: ئێمە لێمان روونەو دڵنیاین کەمەبەست لەوشەی ئەو ئایەت‌و فەرموودانە واتای رواڵەتییەکەیان نییە. لەبەر ئەوە بەشێوەی مەجاز سەیر دەکرێن‌و رێگرێك نییە بۆ تەئویلکردنیان لەبەر ئەوە وشەی (**الوجه**) تەئویل دەکەن بە زات(**الذات**). وەوشەی(الید)بە توانا(**القدرة**)، هەروەها ئەوانی تریش بەو جۆرە تەئویل دەکەن. دەیانەوێ خۆیان لەلێچوان‌و(موشابەهە)ی خوا بەخەڵکییەوە بپارێزن، ئەوەش چەند نموونەیەکی قسەکانیان لەو بارەوە:

١- ئەبو فەرەجی(ابن الجوزی)حەمبەلی ، لەکتێبەکەیا (دفع‌شبهة التشبیه) دەڵێ : خوای تەعالا فەرموویەتی:(***ویبقی وجه ربك***) (١) تەفسیر زانەکان وتوویانە: پەروەردگاری تۆ دەمێنێتەوە. وەلەم فەرموودەیەی خوای تەعالا دا(***یریدون وجهه***)(٢) گوتوویانە: خوایان مەبەستە.. وەلەبارەی(***کل شیء هالك إلا وجهه***)(٣) وەوە زوحاك و ئەبوعوبەیدە(الضحاك وأبوعبیدة) :وتوویانە: هەموو شتێك تیا دەچێت جگە لە خۆی.

وەلەسەرەتای کتێبەکەیەوە بەشێکی تری خستۆتە سەرباسەکەی بۆ پەرچدانەوەی قسەی ئەوانەی کەدەڵێن: وەرگرتن‌و کارکردن بەرواڵەتی

---

(١) الرحمن/٢٧. واتە: رووی پەروەردگارت دەمێنێتەوە .

(٢) الانعام/٥٢. واتە: رووی خوایان مەبەستە .

(٣) القصص /٨٨. واتە: هەموو شتێ تیادەچێت جگە لەرووی پەروەردگارت .

ئەو ئایەت و فەرموودانە ڕێڕەوی پێشینانە. پوختەی قسەکەی ئەوەیە: وەرگرتنی ڕواڵەتی ئەو ئایەت و فەرموودانە بریتییە لە بەجوستەکردن و لێچوواندن، چونکە ڕواڵەتی وشەکە بۆ ئەو واتایە دانراوە. بۆنموونە: واتای ڕاستەقینەی دەست جگە لەو ئەندامە هیچی ترنییە.

لەڕاستیدا دەست جگە لەوئەندامە دیاریکراوە مەعنایەکی تری نییە. وە هەروەها .ئەوانی تریش.. بەڵام ڕێڕەوی پێشینان وەرگرتنی ڕواڵەتی وشەکان نییە. بەلکو بێدەنگ بوونە لەباسکردن و ڕۆچوون تیایانا..

وە هەروەها پێی وایە: ناوبردنی ئەو ئایەت و فەرموودانە بەئایەت و فەرموودەکانی صیفات. ناوبردنێکی داهێنراوە و دروستکراوە و بیدعەیە،نە لە قورئانا بەو جۆرە ناوبراوە و نەلە فەرموودەدا . ئەوانە حەقیقی نین و تەنیا (ئیضافە) و ددانە پاڵ نەبێ هیچی ترنین. بۆ سەلماندنی قسەکانی خۆی بەلگەو دەلیلێکی زۆری هێناوەتەوە، کە لێرەدا بوار بۆباسکردنیان نییە..

٢ـ فەخرەدینی ڕازی لەکتێبەکەیا (أساس التقدیس) دەڵێ: ئەوەبزانە ناگونجێ دەقە قورئانییەکان بەپێی ڕواڵەتیان بەکار بهێنرێن لەبەر چەند هۆ:

یەکەم: ڕواڵەتی فەرموودەی خوا: «ولتصنع علی عیني» طه/٣٩ وادەگەیەنێ کە مووسا ـ علیه السلام ـ لەسەر ئەو چاوە جێگیربێ و پێوەی

لکابێ و بەسەر چاوەکەیشەوەبێ. دەی هیچ عاقڵێك شتی وا ناڵێت..

دووەم، خوای تەعالادەفەرموێ: «واصنع الفلك بأعيننا» هود/٣٧. روالەکەتەی ئەوە دەگەیەنێ: کەرەسەی دروستکردنی کەشتییەکە خودی چاوەکەی خوابێ!! ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە دانانی چەند چاوێك لەرووبەکدا ناشیرینە، چونکە (أعين) بۆ چەند چاوێك بەکاردەهێنرێت ..کەوابوو دەبێ ئەو ئایەتانە تەئویل بکرێن، ئەوەش بەوجۆرە دەبێ کەئەم وشانە واتاو مەعنایەکی تریان لێبدرێتەوە لەو پەڕی چاودێری و بایەخ پێدانا..

٣ـ ئیمامی غەزالی لەبەرگی یەکەمی کتێبەکەیا (احياء علوم الدين)، کاتێ باسی نیسبەتی زانیاری روالەتی دەکات لەبەرامبەر زانیاری پەنامەکی(الباطن)ەوە ،وە هەریەك لەو دوو جۆرەیش چەندەها بەشیان لێپەیدا دەبێت، وەکامیان تەئویل دەکرێت و کامیان تەئویل ناکرێ، دەڵێت: بەشی سێهەم، ئەوشتەی باسی دەکرێت دەبێ بەشێوەیەکی وابێ ئەگەر بە را شکاوی(صراحة) باسکرا بزانرێ و زەرەرو زیانی تیانەبێ. بەڵام هەندێ جار لەسەر شێوەی خواستن (الاستعارة) ونیشانە(الرمز) بەکار دەهێنرێ و باسدەکرێ بۆ ئەوەی لەدڵی گوێگرا زیاتر جێگیربێ. وەك ئەم فەرمودەیە: «إن المسجدَ لَيَنْزَوِي مِنَ النّخامَةِ كما تنزوي الجِلْدَةُ مِنَ النارِ»واتە: چۆن پێست بەئاگر کرژ دەبێت مزگەوتیش ئاوەها بە بەلغەم تێکردن کرژ

دەبێ. لێرەدا مەبەست ئەوە نییە  رووبەری مزگەوت بەهۆی تف تێکردنەکەوە بچێتەیەك وکرژ ببێت . بەڵکو مەبەست ئەوەیە : چۆن دژایەتی لەنێوان پێست و ئاگردا هەیە ئاوەهایش دژایەتی لەنێوان مزگەوت و تفکردنە مزگەوتا هەیە. چونکە مزگەوت شوێنێکی پاك و بەرێزە ، وەتف تێکردنیش نیشانەی سووکایەتییە، لەبەر ئەوە شوێنێك کەپیرۆزو بەرێز بێ نابێ شتێکی تێبکرێ کەنیشانەی سووکایەتی بێ..

وەهەروەها ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وآله وسلم ـ کە دەفەرموێ : «أَمَا يَخْشَى الذي يرفعُ رأسَهُ قبلَ الإمامِ أنْ يُحَوِّلَ اللهُ رأسَهُ رأسَ حمارٍ؟» رواه البخاری ومسلم ، واتە : ئەوەی لەپێش ئیمامەوە سەر بەرز دەکاتەوە ، ئایا ناترسێ خوا سەری بگۆڕێ بە سەری کەر؟

ئەم گۆڕینە هەرگیز لە شێوەی وێنەو صورەتا نەبووەو نابێت، بەڵام لەبارەی مەعناو واتاوە هەبووەو دەبێت. چونکە مەبەست لەسەری کەر ئەوەنییە کەبە حەقیقەت و راستەقینە لەوێنەو شکلاً ببێتە سەری کەر، بەڵکو لە تایبەتمەندی و (خصوصیات) دا دەبێت، کە بریتییە لە گەمژەیی و نەفامی، ئەوەی لەپێش ئیمامەوە سەربەرز دەکاتەوە لە نەفامی و گەمژەییدا بێگومان سەری بووەتە سەری کەر، ئەمەیان مەبەستە نەك شکڵ و وێنە.

بۆ زانینی ئەوە کەمەبەست مەعنای وشە روالەتییەکە نییە، دووشت هەیە: بەلگەی عەقلی و بەلگەی شەرعی .

بەلگە عەقلییەکە ئەوەیە کە لە روالەتا وەرگرتنی واتای وشەکە مومکین نەبیّ‌و دەست نەدا ، وەك لەم فەرمودەیەدا: **(قلبُ المؤمنِ بَين إِصْبِعَينِ منْ أصابِعِ الرَّحمٰنِ)** رواه مسلم : واتە: دلی ئیماندار لەنێو دوو پەنجەدایە لەپەنجەکانی خوا ، ئەگەر ئێمە دلی ئیماندارەکان بپشکنین پەنجەیان تیا نابینین. لەمەوە دەزانین کە ئەمە کینایەیە لەبری قودرەت‌و توانایی خوا ، کەرازو رۆحی شاراوەی پەنجەکانە و لەبیاتی تواناو قودرەت پەنجەی بەکار هێناوە، وەك ئەوە بفەرموێ :دلی ئیماندار لەبەردەستی قودرەت‌و توانایی خوادایە..پەنجەی بەکارهێناوە تا تێگەیشتن لەمەعنای تەواوی قودرەت زیاتر لە دلاّ جێگیر بیّ‌و بچەسپیّ».

ئەوەندەی باسمانکرد بەسە ، چونکە لەشوێنی تریشا وێنەی ئەم قسانە باس دەکەین..

تائێرە رێرەوی پێشینان‌و شوێنکەوتوان لەبەر دەمتا روون‌بووەوە ، ئەم دوو رێگەیەش لەنێو زانایانی عەقیدەناس‌و پێشەوای موسلمانانا کێشەیەکی زۆری لەسەر بووەو جێی‌راو بۆچوونی جیاواز بووە. هەر دەستەیەك بەدەلیل‌و بەلگەوە پشتگیری بۆ چوون‌و رێرەوی خۆی کردووە. ئەگەر لەباسەکە بکۆلیتەوە حالی دەبیت کەماوەی دژایەتی

لەنێوان ئەو دوو ڕێڕەوەدا شتێکی وا نییە ئەگەر هەردوولا دەست لەسەر پەڕی و دەمارگیری هەلگرن ، وەباسکردن لەبارەی ئەم حالەو بابەتەوە هەرچەند درێژە بکێشێ تەنیا یەك سەرەنجامی دەبێت ئەویش ئەوەیە: حەقیقەتو مەبەست سپاردنە بەخوای تەبارەك وەتەعالا ـ إن شا ءالله ـ ئەوەشت بەدرێژی بۆباس دەکەین.

* * *

## لەنێوان پێشینانو شوێنکەوتواندا :

لەمەوبەر زانیت کە ڕێڕەوی پێشینان لەو ئایەتو فەرموودانەداکە پەیوەندییان بەصیفەتەکانی خوای تەعالاوە هەیە باوەش پیاکردنیانە بەو جۆرەی هاتوون، وەلە تەفسیرو تەئویلی بێدەنگ دەبن.

وەڕێڕەوی شوێنکەتوانیش وایە : بەجۆرێك تەئویلیان دەکەن کە لەگەڵ مەزنی و گەورەیی‌خوادا بگونجێن ، وەپیشانی بدەن خوا لەوە دوورو بەرییە کە لە مەخلوقی خۆی بچێت.

وەزانیشت جیاوازییەکی بە هێز لەنێوان هەردوو دەستەی خاوەن راو بۆچووندا هەیە، وەئەویش سەری کێشا بۆ ئەوە ناو ناتۆری دەمارگیری لەیەکتر بنێن. ئایا جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە ؟

واله چەند خالێکدا پێشچاوی دەخەین:

یەکەم : هەردوو کۆمەڵ یەکران لەوەدا کە خوای تەبارەك وەتەعالا بەرییە لەوەی لەمەخلوقاتی بچێت،،

دووەم : هەرکام لەوان پروای وایە کە : مەبەست لە وشەی ئەو دەقانە «النصوص»دا کە لەبارەی حەقتەعالاوە باسکراون ئەومەعنا روالەتیانەیان نییە کە لەزماندا بۆ مەخلوقات دانراون ، ئەوەش لەو هاورا بوونیانەوە پەیدا دەبێت کە خوا لە مەخلوقی ناچێت و هەردوولا لێچوواندن لەخوا دوور دەخەنەوە..

سێهەم: لەهەردوولا هەموان دەزانن : وشە بۆ ئەوە دادەنرێت تا ئەوەی پێ دەربېرێت کە لە ناو دەروونا هاتو چۆدەکات، واتە: مەبەستی ناودەروونی پێ دەربېرێت، یا ئەوشتەی کە دەکەوێتە بەریەکێك لە هەستەکان، وە ئەم وشانەش لەلایەن خەلکەوە دانراون و رێزمانیان بۆ دانراوە، زمانیش هەرچەندە فراوان و بەرین بێ مادام ئەوانەی بەو زمانە قسە دەکەن ئاگایان لە حەقیقەت و ناوەرۆکی شتێ نەبێ، ناتوانن ناو بۆ ئەو شتە دابنێن و بیخەنە ناو سنووری زمانەکەوە. ئەو حەقیقەتانەش کە پەیوەندییان بە خودی خوای تەبارەك وەتەعالاوە هەیە لەو بابەتەن. لەبەر ئەوە زمان زەبوونەو توانای ئەوەی نییە وشە گەلێکی وامان بۆ بێنێت کەواتای ئەو حەقیقەتانە کتومت بدات بەدەستەوە، حوکمکردن لەم وشانەدا بۆ دیاریکردنی واتاو مەعنایان خۆ لەناو بردنە..

ئەگەر ئەوە سەلمێنرا وجێگیربوو ئەوا(سەلەف)و (خەلەف) هەردوو هاوڕان لەسەر بنچینە وئەصلی تەئویل، جیاوزی نێوانیان

لەوەدا تەنگ دەبێتەوە:کە،(خەلەف) هەرکاتێ پاكو مونەززەهی خوا ناچاریکردبن پەنا ببە نە بەر دیاریکردنی ئەو مەعنایانە تا عەقیدەی جەماوەر لەگومانی لێچووان‌و (تەشبیهە) بپارێزن ، زیادەڕەوییان لە دیاریکردنی واتای مەبەست و مەقصودا کردووە..ئەو(خیلاف) و جیاوازییەش خیلافێکە شیاوی ئەو هەموو قرەوقالەو نارەحەتییە نییە.

* * *

### *پەسەندکردنی ڕێرەوی پێشینان:*

ئێمە بڕوامان وایە:کە،ڕای پێشینان لە بێدەنگ بوون‌و حەوالەکردنی زانینی ئەو مەعنایانە بۆ لای خوای تەبارەك وەتەعالا بێوەی ترو شیاوترە بۆ شوێنکەوتن ، بۆ لەناو بردن‌و یەك لایی کردنەوەی تەئویل‌و تەعطیل، نەمەعنایان لێ‌دەدەینەوە بەدیاریکردنی مەبەست، نە ئەو صیفەتانەش لەکار دەخەین بەو جۆرە بەصیفەتیان نەزانین ـ لەبەر ئەوە بێدەنگ بوونمان پێ‌چاکترە ـ جا ئەگەر تۆیش لەوانە بوویت کە خوا بەدلنیایی باوەڕ بەختەوەری کردوون، وە بەفێنکی یەقین دڵو دەروونی فێنك کردوونەتەوە، ڕاي پێشینان بەهیچ ڕایەکی‌تر مەدەو مەیگۆڕەرەوە..

لەگەڵ ئەوەشدا بڕوامان وایە : ئەو تەئویلەی شوێنکەوتوان دەیکەن نابێتە هۆی دەرکردنی حوکمی کافربوون‌و فاسقبوون بەسەریاندا .

وەشایەنی ئەو ناکۆکییە دوورو درێژەیش نییە لەنێوان ئەوانو غەیری ئەواندا ، چ لەسەردەمی کۆنو چ لەم سەردەمەی خۆماندا . چونکە دلی ئیسلام لەهەموو ئەمانە فراوانترە. ئەوەتە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەمبەل ـ ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ کە لە هەموو کەس زیاتر پەیوەندە بەڕای پێشینانەوە ـ ڕەحمەتی خوایان لێبێ ـ لەچەند شوێنێکا پەنای بردۆتە بەر تەئویل. وەك لەم فەرموودەیەدا : «الحَجَرُ الأسْوَدُ يَمِينُ اللهِ في أرضهِ »(١) رواه الحاكم. وەئەم فەرموودەیەش : «قلبُ المؤمن بَينَ إصْبَعَينِ من أصابعِ الرحمنِ »(٢) رواه مسلم. وەئەم فەرموودەی تری پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ کە دەفەرموێ : « إنّي لأجِدُ نفسَ الرّحمنِ من جانبِ اليَمَنِ »(٣) رواه أحمد.

ڕایەکی ئیمامی ئەوەویم دیوە ـ ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ سوودی ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مەودای جیاوازی نێوان هەردوولا کورتو تەنگ دەکاتەوەو بوارێك بۆ ناکۆکیو دەمەقالە ناهێلێتەوە،بەتایبەت شوێنکەوتوان لە تەئویلکردنەکەیاندا خۆیان بەم دەستەواژەیە بەستۆتەوە: دەبێ ئەو تەئویلە بەپێی عەقلو شەرع دروستبێ و بەیەکێ لەڕێساکانی دینا هەڵنەشاخێتو لەیەك نەدەن..

---

(١) واتە: بەردە ڕەشەکە«الحجر الاسود» لای ڕاست،یا دەستی خوایە لە سەر زەویەکەیدا ..

(٢) واتە: دلی ئیماندار لە نێوان دوویەنجەدایە لە پەنجەکانی خوا ..

(٣) واتە: من هەست بە هەناسەونەفەسی خوا لەلای یەمەنەوە دەکەم..

رازی له کتێبی( أساس التقدیس)ی خۆیا دەڵێ:«ئینجا ئەگەر ئێمە بەشێوەی پێشکەشکردن رێی تەئویل کردنماندا ،بەدووررو درێژی بەباسی ئەو تەئویلانەوە خەرۆدەبین. ئەگەر رێگەی تەئویلیشمان نەدا ئەوا زانینی ئەو مەعنایانەمان داوەتە دەست خوار بەومان سپاردووە. ئەوەش باسای گشتییە بۆ هەموو(متشابە)ێك و دەبێ بۆ لای ئەو باسا بەبگەرێینەوە. تەوفیق و سەرکەوتنیش بەدەست خودایە ».

پوختەی باسەکە ئەوەیە:(سەلەف و خەلەف) لەوەدا یەکن کە مەبەست ئەو مەعنا رواڵەتییە نییە کەلەناو خەلکیدا باوە. ئەمەش خۆی لە خۆیا تەئویلە . وەهەروەها یەکن لەوەدا کە: هەر تەئویلێك بەرێسایەکی شەرعیدا هەلشاخێت‌دروست نییە.

جیاوازی نێوانیان لەوەدا ماوەتەوە: ئایا دروستە تەئویلی وشەکان بەو جۆرەی شەرع رێگەی دەدا ؟ یان نە؟ ئەمەش ئاسانە هەروەك دەیبینی. ئەوەتە هەندێ لە خودی سەلەف پەنایان پێبردووە. ئەوەی کە ئێستا دەبێ خەمی هەموو موسلمانێك بێ یەکخستنی ریزەکان‌و کۆکردنەوەی قسەکانە بەو جۆرەی لەتوانامانداهەبێ‌و رێی پێ بەەین. تەنیا خوامان بەسەو ئەویش باشترین کۆمەك و پشتیوانە.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**



| لاپەرە | نـــــــــاوەرۆك |
|---|---|
| ٥٥ | ٧ ـ ویست و ئیرادەی خوا . |
| ٥٨ | ٨ـ زانیاری خوا . |
| ٦٢ | ٩ـ ژیان و حەیاتی خوا . |
| ٦٤ | ١٠ـ بیستن و بینینی خوا . |
| ٦٦ | ١١ـ قسەو ئاخاوتنی خوا . |
| ٦٧ | لە نێوان صیفەتەکانی خواو خەلکی دا . |
| ٦٩ | بەلگەی عەقلی و ژیر بێژی . |
| ٧١ | پرسیارێك . |
| ٧٥ | قسەی زانایانی سروشت . |
| ٧٦ | دیکارت.. نیوتن .. |
| ٧٧ | هێرشەل ، لینیە .. |
| ٧٨ | سبنسەر . |
| ٨٠ | ئەو ئایەتانەی کە هەندێ صیفات باس دەکەن . |
| ٨١ | **چەند نموونەیەك لەئایەتەکانی صیفات :** |
| | دەموچاو ، دەست ، دەرۆن ، پێکەنین ، شادمانی . هاتن |
| ٨٩ | نموونەی ئەو فەرموودانەی کە هەندێ صیفات باس دەکەن . |
| ٩١ | رەنگ و وێنە .پێی ، شادمانی . |
| ٩٢ | لە م بارەوە رای خەلکی دەبێتە چوار بەش : |
| ٩٢ | ١ـ دەستەی یەکەم |
| ٩٣ | ٢ـ دەستەی دووهەم. |
| ٩٤ | رێرەوی پێشینان «السلف». |
| ١٠٠ | رێرەوی زایانانی شوێنکەوتوو «الخلف». |
| ١٠٦ | لە نێوان پێشینان و شوێنکەوتواندا . |
| ١٠٨ | پەسەندکردنی رێرەوی پێشینان . |
| ١١٢ | ناوەڕۆك |